بسم الله الرحمن الرحيم

**پوختە باسێك دەربارەی:-**

# مانگی ڕەمەزان

## ئامادەكردنی

**بێكلۆیی**

**٣ی ڕەمەزانی ١٤٣١كۆچی**

**پێگەی مینبەر**

**www.pegayminber.com**

**١٤١٣- كۆچی**

# بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله، نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلا تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ

يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَتَسَاءَلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً، يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً

أما بعد: فإن أصدق الحديث كلام الله، وخير الهدي هدي محمد- صلى الله عليه وعلى آله وسلم- وشر الأمور محدثاتها وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار. صحيح مسلم

ئەو نامیلکە چوکەڵەی بەردەستت پوختە باسێکە دەربارەی ئەحکامەکانی هەریەك لەو نۆ تەوەرە باسەی دواتر لە درێژەی باسەکەدا دەیخوێنیەوە، خوای گەورە تاعەت و عیبادەتێکی ڕاست و دروست و لەسەر سوننەتی پێغەمبەرمان بە قسمەت بکات – صلی الله علیه وسلم- بە ئومێدی ئەوەی خوای گەورە ئەم نوسینە قبوڵ بکات و لە ئەجرو پاداشتەکەی مەحرومنان نەکات و ئەوانەی دەیخوێننەوە کەڵکی لێوەرگرن و دینداریيەکی ڕاست و دروست بەجێ بگەیەنن لەو مانگە پیرۆزەدا، هەڵە و کەم و کورتییەکانی ئەم بابەتە هەمووی لە منەوەیە، ڕاست پێکان و ڕێك و پێکییەکەشی بە تەنها فەزڵ و ڕوحمی خوای گەورەیە.

## تەوەرەباسی یەکەم: ڕۆژوو (الصوم – الصيام)

- پێناسەی ڕۆژوو
- لەگەڵ بینینی مانگ ڕۆژوو بگرن
- ڕۆژووی ( يوم الشك) بەڕۆژوو مەبن
- گەورەیی ئەو مانگە پیرۆزە
- مەرجەکانی ڕۆژوو
- ڕۆژوو بەچی  پوچەڵ دەبێتەوە؟
- سوننەتەکانی ڕۆژوو
- ڕۆژوو لەسەر کێ فەڕزە؟
- ڕێگە پێدراوەکان
- نەهی لێکراوەکان
- حوکمی ڕۆژوو

## تەوەرەباسی دووەم: نوێژی ویترو تەڕاویح(صلاة الوتر، صلاة التراويح)

- ژمارەی ڕکاتەکانی
- چی دەخوێندەوە لە نوێژەکاندا؟
- کاتی نوێژی ویتر
- چۆنیەتی نوێژی ویتر
- دوعای قنوت

## تەوەرەباسی سێیەم: شەوی قەدر (ليلة القدر)

- گەورەیی شەوی قەدر

- نزاو پاڕانەوە لە شەوی قەدر

## تەوەرەباسی چوارەم: خەڵوەتگرتن (الاعتكاف)

- مەرجەکانی ئیعتیکاف

- ئەو کارانەی نەهیان لێکراوە لە کاتی خەڵوەتدا

- ئەو کارانەی جائیزن لە کاتی خەڵوەتدا

## تەوەرەباسی پێنجەم: زەکاتی سەرفترە (زكاة الفطر)

- حوکمی زەکاتی سەرفرە

- حیکمەتی زەکاتی سەرفترە

- جۆرەکانی زەکاتی سەرفترە

- کاتی بەخشینەوەی زەکاتە

- کۆکردنەوەی زەکاتەکە لەیەك شوێندا

- ئەو کەسانەی حەقی وەرگرتنی زەکاتی سەرفترەیان هەیە؟

- چۆنییەتی بەخشینەوەکەی

## تەوەرەباسی شەشەم: چەند پرسیارو وەڵامێك دەربارەی زەکاتی سەرفترە

- تایبەتە بەو پرسیارانەی لە جەلسەکانی مانگی ڕەمەزاندا لە شێخ (ابن العثيمين) پرسیار کراوە – ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێت.

## تەوەرەباسی حەوتەم: نوێژی جەژنی ڕەمەزان ( صلاة عيد الفطر)

- حوکی نوێژی جەژن

- سوننەتەکانی ڕۆژی جەژن

- چۆنیەتی تەکبیرەی ڕۆژی جەژن

- کاتی نوێژی جەژن

**- نوێژی جەژن بەبێ بانگ و قامەت**

**- چۆنییەتی نوێژی جەژن**

**- وتاری جەژن**

**- چۆنییەتی جەژنە پیرۆزە**

## تەوەرەباسی هەشتەم: ڕۆژووی شەشەڵان

**- گەورەیی ڕۆژووی شەشەڵان**

## تەوەرەباسی نۆیەم: ڕەمەزان لە مێژووی ئیسلامیدا

**- تایبەتە بە ڕوداوە هەرە گرنگەکانی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز لە مێژووی ئیسلامییدا**

# تەوەرەباسی یەکەم: ڕۆژوو (الصوم – الصيام)

## - پێناسەی ڕۆژوو

لەزاراوەی زمانەوانییەوە: ڕۆژوو بە مانای وازهێنان و خۆبەدوورگرتن دێت بۆ ماوەو کاتێکی دیاریکراو. کاتێك خاتوو (مريم) –عليها السلام- دوای منداڵ بوون گەڕایەوە بۆ نێو قەومەکەی بڕایاریدا قسە نەکات و ئەگەر پرسیاریشی لێ بکەن وەڵام نەداتەوە، خوای گەورە دەربارەی بەسەرهاتەکەی لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: **{ فَكُلِي وَاشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِي إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنسِيًّا} مريم: ٢٦**

لە زاراوەی شەرعییدا: ڕۆژوو بە مەبەستی وازهێنان و دوورەپەرێزییە لە خواردن و خواردنەوەو کاری سەرجێی ( مەبەست جيماعی نێوان ژن و پیاوە، یا خۆڕەحەت کردن) لە بەرەبەیانەوە (بانگی بەیانی) دەستپێدەکات و بە خۆرئاوابوون (بانگی شێوان) کۆتایی دێت.

## - لەگەڵ بینینی مانگ ڕۆژوو بگرن

پێغەمبەری خوا – صلى الله عليه وسلم- لەفەرمودەیەکدا کە ئەبو هورەیرە – ڕەزای خوای لێبێت- ڕیوایەتی کردووە دەفەرموێ: **قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: [صوموا لرؤيته وأفطروا لرؤيته فإن غبي عليكم فأكملوا عدة شعبان ثلاثين] مسلم ١٠٨ و البخاري ٤/١٠٦ بە لەفزی بوخاری**

لە ڕیوایەتێکی تردا فەرموی: **[ إِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَصُومُوا, وَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَأَفْطِرُوا, فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَاقْدُرُوا لَهُ ] مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ** واتە: ( بە دیتنی – مانگ- بەڕۆژوو بن، وە بە دیتنی - مانگ - بیکەن بە جەژن، ئەگەر لێتان تێکەڵ بوو حیسابی بکەن) سی ڕۆژەی شەعبان بژمێرن دەکەونە ڕەمەزانەوە، وەك لە ڕیوایەتەکەی موسلیم هاتووە.

**وَلِمُسْلِمٍ: [ فَإِنْ أُغْمِيَ عَلَيْكُمْ فَاقْدُرُوا ] لَهُ [ ثَلاثِينَ]**

**وَلِلْبُخَارِيِّ: [ فَأَكْمِلُوا اَلْعِدَّةَ ثَلَاثِينَ ]** سی ڕۆژەی شەعبان تەواو بکەن، ڕۆژی دواتر دەکەوێتە یەکەمین ڕۆژی ڕەمەزانەوە.

**فِي حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ [ فَأَكْمِلُوا عِدَّةَ شَعْبَانَ ثَلَاثِينَ] (صحيح رواه البخاري( ١٩٠٩ ).**

لە ڕیوایەتەکی ئیبنو عەمەردا - ڕەزای خوایان لێبێت- فەرمووی: **[ تَرَاءَى اَلنَّاسُ اَلْهِلَالَ, فَأَخْبَرْتُ رَسُولَ اَللَّهِ ﷺ أَنِّي رَأَيْتُهُ, فَصَامَ, وَأَمَرَ اَلنَّاسَ بِصِيَامِهِ ] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ, وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ, وَالْحَاكِمُ.** واتە: ( خەڵکی بۆدیتنی مانگ دەگەران، هەواڵم دا بە پێغەمبەری خوا

ــصلی الله علیه وسلم ــ که مانگم دیوه، ئینجا بەڕۆژوو بوو، وه فەرمانی به خەڵکی کرد بەڕۆژوو بن).

ئەم فەرمووده پیرۆزه بەڵگەیه که بۆ بینینی مانگ شایەتی کەسێکی مسوڵمانی ڕاستگۆ به شایەت وەردەگیرێ و دەکرێ به ڕەمەزان، بەڵام بۆ ڕۆژوو شکاندن و جەژن دوو شایەتی گەرەکه.

## - ڕۆژووی ( یوم الشك) بەڕۆژوو مەبن

ئەوڕۆژەیه خەڵکی گومانیان بۆ دروستبووه له داخل بوونی مانگی ڕەمەزان و تەواو دڵنیا نین بۆ ڕۆژی داهاتوو ڕەمەزانه یان ڕۆژێکی کورتهەڵێناوه، پێغەمبەری خوا ــ صلی الله علیه وسلم- نەهی کردووه له بەڕۆژووبوون تێیدا **عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ ﷺ قَالَ: [ مَنْ صَامَ اَلْيَوْمَ اَلَّذِي يُشَكُّ فِيهِ فَقَدْ عَصَى أَبَا اَلْقَاسِمِ ﷺ ] وَذَكَرَهُ اَلْبُخَارِيُّ تَعْلِيقًا, وَوَصَلَهُ اَلْخَمْسَةُ, وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ, وَابْنُ حِبَّانَ.** واته: ( ئەوەی ڕۆژی گومان (یوم الشك) بەڕۆژوو بێ، سەرپێچی پێغەمبەری کردووه).

## - گەورەیی ئەو مانگه پیرۆزه

له چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوادا ــ صلی الله علیه وسلم ــ باسی فەزڵ و گەورەیی ئەو مانگه بەرزو پیرۆزه پڕ خێروبەرەکەته دەکەین.

**- عن أبي هريرة رضي الله تعالى عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم [ كل عمل بن آدم يضاعف الحسنة بعشر امثالها الى سبعمائة ضعف قال الله تعالى الصوم لي وأنا أجزي به يدع شهوته وطعامه من أجلي للصائم فرحتان فرحة عند فطره وفرحة عند لقاء ربه ولخلوف فم الصائم اطيب عند الله من ريح المسك] (رواه مسلم)** واته:(هەموو کردەوەیەکی نەوەی ئادەم یەك به ده چاکەیه بەمشێوەیه تا یەك به حەوسەت، خوای گەوره دەفەرموێت: ڕۆژوو بۆ منه، من خۆم پاداشتی دەدەمەوه، واز له شەهوەت و خواردن دەهێنێ لەبەر من، ڕۆژووەوان دوو خۆشی هەیه؛ خۆشیەکیان کاتێ ڕۆژوو دەشکێنێ ئەوەی تریان کاتێ به دیداری خوای خۆی دەگات، بونی دەمی ڕۆژووەوان له لای خوای گەوره خۆشتره له بۆنی میسك).

**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رضى الله عنهما أَنَّ رَسُوْلَ اللهِ صلى الله عليه وآله وسلم قَالَ: [أَلصِّيَامُ وَالْقُرْآنُ يَشْفَعَانِ لِلْعَبْدِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. يَقُوْلُ الصِّيَامُ: أَيْ رَبِّ! مَنَعْتُهُ الطَّعَامَ والشَّهَوَاتِ بِالنَّهَارِ فَشَفِّعْنِي فِيْهِ.. فَيُشَفَّعَانِ]. رَوَاهُ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ وَالْحَاكِمُ وَالْبَيْهَقِيُّ، وَقَالَ الْحَاكِمُ : هَذَا حَدِيْثٌ صَحِيْحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ.**

واتە: ( ڕۆژوو و قورئان لە ڕۆژی دواییدا شەفاعەت بۆ بەندە دەکەن، رۆژوو دەڵێ: ئەی خوایە، بە ڕۆژ مەنعم کردبوو لە خواردن و شەهوەتی، بمکە تکاکاری.. ئینجا تکا بۆ خاوەنەکەی دەکەن).

**- عن سهل بن سعد رضي الله تعالى عنه عن النبي صلى الله عليه وسلم قال:[ ان في الجنة بابا يقال له الريان يدخل منه الصائمون لايدخل منه احد غيرهم يقال أين الصائمون فيقومون لايدخل منه احد غيرهم فاذا دخلوا أغلق فلم يدخل منه أحد] (متفق عليه)**

واتە: ( دەرگایەك لە بەهەشت هەیە پێی دەڵێن ڕەییان، غەیری ڕۆژووەوانان کەسێکی تر لێی ناچێتە ژوورەوە، دەڵێ: کوان ڕۆژووەوانان، ئەوانیش هەڵدەستن و لێی دەچنە ژوورەوە، کە دواکەسیان چووە ژوورەوە ئیتر دادەخرێ و کەسی تری لێ ناچێتە ژوورەوە).

**- عن أبي هريرة رضي الله تعالى عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: [ من صام رمضان ايمانا واحتسابا غفر الله له ما تقدم من ذنبه] (رواه أحمد و اصحاب السنن)**

واتە: ( هەرکەسێ مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێ بەوشێوەی داوای لێکراوەو بە ئومێدی پاداشت بێ، خوای گەورە لە گوناحی ڕابردووی خۆشدەبێ).

**- عن أبي سعيد الخدري رضي الله تعالى عنه أن النبي رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: [ من صام رمضان و عرف حدوده و تحفظ مما كان ينبغي أن يتحفظ منه كفر ماقبله] .(رواه أحمد والبيهقي بسند جيد)** واتە: ( ئەوەی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێ و سنورەکانی نەبەزێنێ و پارێزگاری لەو شتانە بکات کە دەبێ بیان پارێزێ، گوناحی ڕابردووی دەشواتەوە).

**- عن ابي هريرة ان النبي –صلى الله عليه وسلم- قال: [ الصلوات الخمس والجمعه الى الجمعه ورمضان الى رمضان مكفرات لما بينهن اذا اجتنبت الكبائر]** واتە: ( پێنج نوێژە، وە لە جومعەیەکەوە بۆ جومعەیەکی تر، لە ڕەمەزانێکەوە بۆ ڕەمەزانێك، کەفارەتی ئەو گوناحی نێوانیانە ئەگەر خۆی پاراستبێ لە گوناحە گەورەکان).

**- عن أبي هريرة أن النبي ( صلى الله عليه وسلم) قال – لما حضر رمضان - : [ قد جاءكم شهر مبارك افترض عليكم صيامه تفتح فيه أبواب الجنة و تغلق فيه أبواب الجحيم و تغل فيه الشياطين، فيه ليلة خير من ألف شهر من حرم خيرها فقد حرم] (رواه أحمد والنسائي والبيهقي)** واتە: ( بێگومان ئەوە مانگی ڕەمەزان هات کە ڕۆژووەکەیتان لەسەر فەرز کراوە، دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوەو ئەوانی جەهەننەمیش دادەخرێن، شەیتانەکان

کۆت و زنجیر دەکرێن، شەوێکی تێدایە خێری زیاتری لە هەزار مانگ هەیە، ئەوەی خۆی بێبەش بکا لە خێرەکەی ئەوە مەحرومە لێی).

## - مەرجەکانی ڕۆژوو

١. نییەت هێنان ( النیة ) : نییەت یەکەم شەرتی قبوڵبوونی هەر کردەوەیەکە، وە هەر کردەوەیەکیش بەپێی نیەتەکەیەتی، ئەگەر بۆ خوای گەورەو ڕەزامەنی ئەو بێت ئەوە پێکاویەتی و ئەجرو پاداشتی دەبێ، بە پێچەوانەشەوە کردەوەکەی لە سەرەتاوە پوچەڵەو نەك پاداشت وەرناگرێ بەڵکو لەسەریشی تاوانبار دەبێت.

خوای گەورە دەربارەی نییەت و پاکڕاگرتنی کردەوەکان و خوا پێمەبستبوون لە جێبەجێکردنیان دەفەرموێت: **{ فَمَنْ كَانَ يَرْجُوا لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا} الكهف: ١١١**

پێغەمبەری خوا – صلى الله علیه وسلم – دەفەرموێت: **[ إِنَّمَا الاَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِيٍ مَا نَوَي]**

**وَعَنْ حَفْصَةَ أُمِّ اَلْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا, عَنِ اَلنَّبِيِّ ﷺ قَالَ: [ مَنْ لَمْ يُبَيِّتِ اَلصِّيَامَ قَبْلَ اَلْفَجْرِ فَلَا صِيَامَ لَهُ ] رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ, وَمَالَ النَّسَائِيُّ وَاَلتِّرْمِذِيُّ إِلَى تَرْجِيحِ وَقْفِهِ, وَصَحَّحَهُ مَرْفُوعًا اِبْنُ خُزَيْمَةَ وَابْنُ حِبَّانَ** واتە: ( ئەوەی پێش نوێژی بەیانی نییەتی ڕۆژوو نەهێنێ، ڕۆژووی بۆ نییە) ڕۆژووەکەی قبوڵ نابێ ئەگەر خۆی لە خواردن و خواردنەوەش بگرێتەوە.

شوێن و مەنزڵگای نییەتیش لە دڵ و دەروندایە، بە زمان وتنی وەك ئەوەی بڵێ: نیەتمە بەیانی بەڕۆژوو دەبم وارید نەبووەو تەنها بیدعە و داهێنراوێکە، هەستانەوە بە مەبەستی پارشێو کردن خۆی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نییەتی هەیە بەیانی بەڕۆژوو دەبێ.

٢. دوورەپەرێزی و خۆگرتنەوە لە خواردن و خواردنەوەو سەرجێی کردن، لە بانگی بەیانییەوە تاوەکو بانگی ئێوارە، بەڵام لەدوای بانگی ئێوارەوە تاوەکو پێش بانگی بەیانی هەموو ئەوشتانەی لێی حەرام کرابوو گشتی بۆ حەڵاڵە لە خواردن و خواردنەوەو سەرجێی کردن و جیماعی نێوان ژن و پیاو، ئەوەش شەرعی خوای گەورەو سۆزو بەزەیی ئەوە بەرامبەر بە بەندەکانی خۆی و دەفەرموێت: **{ فَالئنَ بَشِرُوهُنَّ وَابْتَغُوا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمْ الْخَيْطُ الابْيَضُ مِنْ الْخَيْطِ الاسْوَدِ} البقرة ١٨٧**

وەك چۆن خواردن و خواردنەوەی بۆ حەڵاڵ كردوون لەو كاتەدا بە هەمان شێوەش چونە لای خێزانەكانتانی بۆ حەڵاڵ كردوون و دەفەرموێت: **{ أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَائِكُمْ} البقرة: ١٨٧**

## - ڕۆژوو بەچی پوچەڵ دەبێتەوە؟

ئەوشتانەی ڕۆژوو بەتاڵ دەكەنەوە دەكرێن بە دوو بەشەوە، هەیانە ڕۆژوو بەتاڵ دەكاتەوەو كەفارەتیشی دەكەوێتە سەر، هەشیانە تەنها گێڕانەوەی ڕۆژووەكەی لەسەرە كە دواتر لە دوای ڕەمەزان دەبێ بیانگێرێتەوە.

١. خواردن و خواردنەوە بە ئەنقەست (الاكل والشراب عمدا)

بە ئەنقەست بخواو بخواتەوە كەم بێ یا زۆر ڕۆژووەكەی بەتاڵ دەكاتەوە، ڕۆژووە دەگرێتەوەو كەفارەتیشی دەكەوێتە سەر، بەڵام ئەگەر خواردن یان خواردنەوەكەی بە هۆی لە یادنەبوون و لە بیرچوونەوە بێت ڕوژووەكەی بەتاڵ ناكاتەوەو لەسەری بەردەوام دەبێت **عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ ﷺ [ مَنْ نَسِيَ وَهُوَ صَائِمٌ, فَأَكَلَ أَوْ شَرِبَ, فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ, فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اَللَّهُ وَسَقَاهُ ] مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ** واتە: (هەر كەسێ لە بیری چوو بەڕۆژوەو خواردی و خواردییەوە، با ڕۆژووەكەی بەردەوام بكات، چونكە خوای گەورە خواردن و خواردنەوەی دەرخوارد داوە).

٢. خۆرشاندنەوە بە ئەنقەست (تعمد القئ)

**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ ﷺ [ مَنْ ذَرَعَهُ اَلْقَيْءُ فَلَا قَضَاءَ عَلَيْهِ, وَمَنْ اسْتَقَاءَ فَعَلَيْهِ اَلْقَضَاءُ ] رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ** واتە: ( كەسێ ڕشانەوە زۆری بۆ هێناو ڕشایەوە، ڕۆژووەكەی قەزا ناكاتەوە ( بەردەوام دەبێ و ڕۆژووەكەی ناشكێنێ)، ئەوەی خۆی بەئەنقەست بڕشێنێتەوە دەبێ قەزای بكاتەوە).

٣. جیماع كردن: **عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: [ جَاءَ رَجُلٌ إِلَى اَلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: هَلَكْتُ يَا رَسُولَ اَللَّهِ. قَالَ: " وَمَا أَهْلَكَكَ ? " قَالَ: وَقَعْتُ عَلَى اِمْرَأَتِي فِي رَمَضَانَ، فَقَالَ: " هَلْ تَجِدُ مَا تَعْتِقُ رَقَبَةً? " قَالَ: لَا. قَالَ: " فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُومَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ? " قَالَ: لَا. قَالَ: " فَهَلْ تَجِدُ مَا تُطْعِمُ سِتِّينَ مِسْكِينًا? " قَالَ: لَا, ثُمَّ جَلَسَ, فَأُتِي اَلنَّبِيُّ ﷺ بِعَرَقٍ فِيهِ تَمْرٌ. فَقَالَ: " تَصَدَّقْ بِهَذَا ", فَقَالَ: أَعَلَى أَفْقَرَ مِنَّا? فَمَا بَيْنَ لَابَتَيْهَا أَهْلُ بَيْتٍ أَحْوَجُ إِلَيْهِ مِنَّا,**

**فَضَحِكَ اَلنَّبِيُّ ﷺ حَتَّى بَدَتْ أَنْيَابُهُ، ثُمَّ قَالَ: "اذْهَبْ فَأَطْعِمْهُ أَهْلَكَ " ]  رَوَاهُ اَلسَّبْعَةُ, وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ**

واته: پیاوێك هات بۆلای پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم – و پێی فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا بە هیلاك چووم. ئەویش فەرمووی: چی وا بەهیلاكی بردووی؟ فەرمووی: لە ڕەمەزاندا جیماعم لەگەڵ خێزانەكەمدا كردووە، فەرمووی: بای ئەوەندەت هەیە بەندەیەكی پێ ئازاد بكەی؟ وتی: نەخێر. فەرمووی: دەتوانی دوو مانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بی؟ وتی: نەخێر. فەرمووی: دەتوانی شەست ژەمە خواردنی هەژاران بدەی؟ وتی: نەخێر، ئینجا دانیشت. سەبەتەیەك خورمایان هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا – صلى الله عليه وسلم- فەرمووی: ئەوە ببەخشەوە. وتی: كەس هەیە لە من فەقیر تر بێ؟ چ ماڵێك هەیە لە ماڵی من زیاتر پێویستیان پێێ هەبێ، پێغەمبەری خوا –صلى الله عليه وسلم- پێكەنی تاوەكی خڕێنەكانی دانی دەركەوتن، ئینجا فەرمووی: برۆ دەرخواردی منداڵەكانتی بدە).

لەو فەرموودەیە دەردەكەوێ جیماع كردن لە ڕۆژی ڕەمەزان و لە كاتی بەڕۆژوو بووندا، ڕۆژوو بەتاڵ دەكاتەوەو كەفارەتەكەشی دەبێ بدات كە یەكێ لەو سێیانە دەگرێتەوە:

١. ئازاد كردنی بەندەیەكی مسوڵمان.

٢. دوو مانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بێت.

٣. ژەمە خواردنی شەست فەقیر بدات.

بەپێی ئەو ڕیز بەندییەی لە فەرموودەكە هاتووە، دەبێ هەوڵی یەكەمیان بدات ئەگەر نەیتوانی ئینجا دەچێتە سەر دووەمیان، ئەگەر دووەمیانی بۆ نەكرا ئینجا دەچێتە سەر سێیەمیان، ئەوە تەنها كەفارەتەكەیە و  دەبێ ڕۆژووەكەش دووبارە بگرێتەوە ( "الإرواء " ٩١/٤).

٤. حەیز و نیفاس: هەركاتێ بێت لە دوای نوێژی بەیانییەوە یا چەند خولەكێك پێش بەربانگ ڕۆژووەكە بەتاڵ دەكاتەوەو نابێ لەسەری بەردەوام بێ، وە ئەگەر هاتوو پێش بانگی بەیانی پاك بۆوە دەبێ نییەتی ڕۆژوو بهێنێ ئەگەر غوسلەكەشی دوا بكەوێت بۆ دوای نوێژی بەیانی. لە حاڵەتی كەوتنە عادەوە تەنها گێڕانەوەو قەزا كردنەوەی ڕۆژووەكەی لەسەرە، كەفارەتی لەسەر نییە.

**عن معاذة قالت : سألت عائشة فقلت : ما بال الحائض تقضي الصوم ولا تقضي الصلاة؟ فقالت : أحرورية أنت ؟ قلت : لست بحرورية ولكني أسأل ، قالت : كان يصيبنا ذلك فنؤمر بقضاء الصوم ولا نؤمر بقضاء الصلاة . رواه البخاري ( ٣١٥ ) ومسلم ( ٣٣٥).**

٥. هەندێ حاڵەتی تر هەن وەك سەفەر و نەخۆشی، خوای گەورە ڕوخسەتی داون لە کاتێکی تر ڕۆژووەکە بگێرنەوە، عولەمایان دەربارەی نەخۆشێك کە نەخۆشی درێژخایەن و ترسناکی هەیە و بەردەوام دەرمان بەکار دەهێنێ فەرموویانە دەتوانێ لە بری هەر ڕۆژوویێك خواردنی فەقیرێك دەدات.

خوای گەورە دەفەرموێ: **{ شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِيَ أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ يُرِيدُ اللّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُواْ الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُواْ اللّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ }** البقرة: ١٨٥

٦. پیرو پەککەوتە: بەتایبەت ئەوانەی زۆر کەوتوونەتە تەمەنەوەو توای ڕۆژوو گرتنیان نەماوە، خوای گەورە لە سۆزو بەزەیی خۆی ڕێگە چارەی ئەوانیشی داناوە. بەڵگەش لەسەر ئەوە قەولەکەی ئیبنو عەبباسە کە عەطاء دەفەرموێ: گوێم لە ئیبنو عەبباس بووە – ڕەزای خوای گەورەیان لێبێت- لەبارەی ئەو ئایەتە پیرۆزە **{ وَعَلَى الَّذِينَ يُطَوَّقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ }** دەیفەرموو: ئەو ئایەتە نەسخ نەبۆتەوە، ئەوە پیرەمێردو پیرێژنی بەساڵاچوو دەگرێتەوە کە توانای ڕۆژوو گرتنیان نییە، لەبری ئەوە بۆ هەر ڕۆژوویێك خواردنی فەقیرێك دەدەن.

عن عطاء أنه سمع ابن عباس يقرأ **{ وَعَلَى الَّذِينَ يُطَوَّقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ }** قال ابن عباس: ( ليست بمنسوخة هو الشيخ الكبير والمرأة الكبيرة لا يستطيعان أن يصوما فيطعمان مكان كل يومٍ مسكيناً ) رواه البخاري ٤٢٣٥

وَعَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ –رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا– قَالَ: { رُخِّصَ لِلشَّيْخِ اَلْكَبِيرِ أَنْ يُفْطِرَ, وَيُطْعِمَ عَنْ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِينًا, وَلَا قَضَاءَ عَلَيْهِ } رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ, وَالْحَاكِمُ, وَصَحَّحَاهُ واتە: ( پیاوی بە تەمەن ڕوخسەت دراوە ڕۆژوو بشکێنێ، لەبری هەر ڕۆژێکیش خواردنی هەژارێك بدات، وە ڕۆژووەکەش قەزا ناکاتەوە).

## - سوننەتەکانی ڕۆژوو

١. پارشێو( السحور) **عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ ﷺ [ تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي اَلسَّحُورِ بَرَكَةً ] مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.** واتە: ( پارشێو بکەن، چونکە پارشێو کردن بەرەکەتی تێدایە)

سوننەتە پاشێوەکەی کەمێ دوا بخات و نزیکی بانگی بەیانی بکەوێتەوە، بە پێچەوانی بەربانگ کردنەوە کە پەلەکردن لێی و دوا نەخستنی لە سوننەتی پێغەمبەرە – صلی الله علیه وسلم-

٢. پەلەکردن لە ڕۆژوو شکاندن (یعجیل الفطر) **عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا, أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ ﷺ قَالَ: [ لَا يَزَالُ اَلنَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا اَلْفِطْرَ] مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.** واتە: ( خەڵکی لەسەر خێرن تا ئەوکاتەی پەلە بکەن لە ڕۆژوو شکاندن).

سوننەتە بە چەند دەنکە خورمایەك ئەگەر دەستی نەکەوت بە ئاو ڕۆژووەکەی بشکێنێ، وە لە فەرموودەی پێغەمبەرا هاتووە – صلی الله علیه وسلم-

**عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ اَلضَّبِّيِّ ﷺ عَنِ اَلنَّبِيِّ ﷺ قَالَ: [ إِذَا أَفْطَرَ أَحَدُكُمْ فَلْيُفْطِرْ عَلَى تَمْرٍ, فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَلْيُفْطِرْ عَلَى مَاءٍ, فَإِنَّهُ طَهُورٌ ] رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ, وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ وَابْنُ حِبَّانَ وَالْحَاكِمُ.** واتە: ( ئەگەر یەکێ لە ئێوە ئیفتاری کردەوە با بە خورما بەربانگ بکاتەوە، ئەگەر دەستی نەکەوت با بە ئاو بەربانگ بکاتەوە، چونکە ئاو پاککەرەوەیە).

٣. نزاوپاڕانەوە لەکاتی بەربانگدا

پێغەمبەری خوا – صلی الله علیه وسلم – لە کاتی بەربانگدا ئەم دووعایەی دەخوێندەوە، کە لە ڕیوایەتەکەی ئیبنو عومەردا هاتووە – ڕەزای خوایان لێبێت-

**عن ابن عمر قال : [ كان رسول الله صلى الله عليه وسلم إذا أفطر قال : " ذَهَب الظمأ وابتلَّت العروق وثبت الأجر إن شاء الله]** رواه أبو داود ( ٢٣٥٧) والحديث : حسَّنه الحافظ ابن حجر في " التلخيص الحبير " ( ٢٠٢/٢).

## - ڕێگە پێدراوەکان

١. حیجامە کردن؛

**عَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا; [ أَنَّ اَلنَّبِيَّ ﷺ اِحْتَجَمَ وَهُوَ مُحْرِمٌ, وَاحْتَجَمَ وَهُوَ صَائِمٌ] رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ** واتە: پێغەمبەری خوا – صلی الله علیه وسلم – حیجامەی کرد لە کاتێکدا ئەو لە ئیحرامدا بوو، وە حیجامەی کرد ئەو بەڕۆژوو بوو).

٢. ماچ کردن و یاری کردن لەگەڵ خێزانیدا ڕێگە دراوە، بۆ کەسێك کە توانای خۆ گرتنی هەیە و لەوە زیاتر سەرنەکێشێ و بۆ حاڵەتی جیماع کردن.

**وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: { كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ ﷺ يُقَبِّلُ وَهُوَ صَائِمٌ, وَيُبَاشِرُ وَهُوَ صَائِمٌ, وَلَكِنَّهُ أَمْلَكُكُمْ لِإِرْبِهِ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ, وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ**

٣. چاو ڕشتن بە کل؛ پێغەمبەری خوا – صلی الله علیه وسلم- کلی لەچاوی موبارەکی کردووە لە کاتێکدا کە بەڕۆژوو بووە.

**وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا, { أَنَّ اَلنَّبِيَّ ﷺ اِكْتَحَلَ فِي رَمَضَانَ, وَهُوَ صَائِمٌ } رَوَاهُ اِبْنُ مَاجَهْ بِإِسْنَادٍ ضَعِيفٍ**

٤. خۆشوشتن لە جەنابەت؛ لە شەودا کە تووشی جەنابەت هاتبێت دەکرێ نییەتی خۆی بهێنێ و دواتر بۆ نوێژی بەیانی غوسڵەکە لەخۆی دەربکات.

**وَعَنْ عَائِشَةَ وَأُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا [ أَنَّ اَلنَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصْبِحُ جُنُبًا مِنْ جِمَاعٍ, ثُمَّ يَغْتَسِلُ وَيَصُومُ ] مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ**

**٥.** خۆ فێنك کردنەوە بە ئاو؛ لە تینوێتی یان لە گەرما بێت دەتوانێ بە ئاو خۆی فێنك بکاتەوە، ئەبو بەکری کوڕی عبد الرحمن لە چەند هاوەڵێکەوە بیستوویەتی کە پێغەمبەری خوایان دیوە – صلی الله علیه وسلم- ئاوی بەسەری موبارەکی داکردووە لە تینوێتی ئاخود لە گەرمان.

**[ لقد رأيت رسول الله صلى الله عليه و سلم يصب على رأسة الماء و هو صائم من العطش أو من الحر] رواة أحمد و مالك و ابو داود بإسناد صحيح**

## - نەهی لێکراوەکان

**١.** بەڕۆژوو نەبوون ڕۆژێك یا دوو ڕۆژ پێش ڕەمەزان

**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ ﷺ { لَا تَقَدَّمُوا رَمَضَانَ بِصَوْمِ يَوْمٍ وَلَا يَوْمَيْنِ, إِلَّا رَجُلٌ كَانَ يَصُومُ صَوْمًا, فَلْيَصُمْهُ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ**

ئەو ڕۆژووانە ناگرێتەوە کە یەکێك لەسەری بەردەوام بووە وەك ڕۆژووی دووشەممە و پێنج شەممە یان ڕۆژووە سوننەتەکانی تر، بەتایبەت ڕۆژووی نەزر.

**٢.** واز هێنان لە وتەی ناشیاوو و نابەجێ؛ وەك جنێودان و زۆر بڵێی و نوکتەبازی و...

**عَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ ﷺ [ مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ اَلزُّورِ وَالْعَمَلَ بِهِ, وَالْجَهْلَ, فَلَيْسَ لِلَّهِ حَاجَةٌ فِي أَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ ] رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ, وَأَبُو دَاوُدَ وَاللَّفْظُ لَهُ**

ڕۆژوو بریتی نییە لە خۆ برسی کردن و خۆ تینو کردن بەتەنها، بەڵکو دەبێ سەرجەم ئەندامەکانی لەو ڕۆژووە بەشدار بن و خۆیان بەدوور بگرن لە سەرپێچی و بێشەرعی.

**٣.** تێکەڵ نەکردنەوەی دوو ڕۆژوو بەسەر یەکەوە؛ بەو مانایەی ڕۆژووی یەکەمی نەشکێنێ و بەردەوامبێ تاوەکو ڕۆژی داهاتوو، واتە دوو ڕۆژوان تێکەڵ بەیەك بکاتەوە، ئەوە نەهی لێکراوەو جائیز نییە.

**وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: { نَهَى رَسُولُ اَللَّهِ ﷺ عَنِ اَلْوِصَالِ, فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ اَلْمُسْلِمِينَ: فَإِنَّكَ يَا رَسُولَ اَللَّهِ تُوَاصِلُ؟ قَالَ: " وَأَيُّكُمْ مِثْلِي? إِنِّي أَبِيتُ يُطْعِمُنِي رَبِّي وَيَسْقِينِي ". فَلَمَّا أَبَوْا أَنْ يَنْتَهُوا عَنِ اَلْوِصَالِ وَاصَلَ بِهِمْ يَوْمًا, ثُمَّ يَوْمًا, ثُمَّ رَأَوُا اَلْهِلَالَ, فَقَالَ: " لَوْ تَأَخَّرَ اَلْهِلَالُ لَزِدْتُكُمْ " كَالْمُنَكِّلِ لَهُمْ حِينَ أَبَوْا أَنْ يَنْتَهُوا } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ**

**- حوکمی ڕۆژوو:** خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمویێت:**{ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ} البقرة١٨٣**

**وە یەکێکە لە پێنج ڕوکنەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام وەك لە فەرموودەکەی جبريل هاتووە- عليه السلام-**

ڕۆژوو فەرزە لەسەر تاکە تاکەی مسوڵمانان کە بالق (بالغ) بوبێت و خاوەن هۆش و ژیری بێت و دەبێ بە ڕۆژوو بێ، ئەو حاڵەتانە ناگرێتەوە کە ڕوخسەت دراون چ بەگێڕانەوە بێ یا بە فیدیە بێ کە پێشتر باسمان کردووە.

## تەوەرەباسی دووەم: نوێژی ویترو تەڕاویح (صلاة الوتر، صلاة التراويح)

پرسیار کرا لە دایکی بڕواداران خاتوو عائیشە – رضى الله عنها – دەربارەی نوێژی پێغەمبەر – صلى الله عليه وسلم – لە مانگی ڕەمەزاندا، لەوەڵامدا فەرمووی: **[ كانَ رسولُ الله - صلى الله عليه وسلم - لا يَزيدُ في رمَضَانَ ولا في غَيْرِهِ على إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً] (اخرجه الشيخان وغيرهما، وهو مخرج في صلاة التراويح ٢٠،٢١- وصحيح ابي داوود ١٢١٢).**

واتە: ( پێغەمبەری خوا – صلى الله عليه وسلم – لە ڕەمەزان و غەیری ڕەمەزان لە یازدە ڕکات زیاتری نەکردووە).

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لە ڕەمەزاندا لەوەندە ڕکاتە نوێژی زیاتری نەکردووە، وارید نەبووە کە بیست و سێ ڕکاتی کردبێت وەك ئەمڕۆ بۆتە شتێکی باوو لەلای خەڵکێکی زۆر لە مانگی ڕەمەزاندا خویان پێوە گرتووە بەبێ هیچ بەڵگەیەك، باشتر وایە پابەندی عیبادەتەکان بین بەوشێوەی لە پێغەمبەرەوە وارید بوون، نەك زیندوو کردنەوەی بیدعە و داهێنراو.

زیندووکردنەوەی شەوانی ڕەمەزان بە نوێژی تەڕاویح و بەکۆمەڵ لە سوننەتی پێغەمبەی خوا بووە – صلی الله علیه وسلم-

شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێت- لە (قیام رمضان، لاپەڕە ١٧،١٨) بەم شێوەیە باسی دەکات و دەفەرموێت: دەربارەی نوێژ لە شەوانی ڕەمەزاندا دوو فەرموودە هاتوون:-

**یەکەمیان: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ ﷺ قَالَ:[ مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا, غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ] مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ**

**دووەم: وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: [ كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ ﷺ إِذَا دَخَلَ اَلْعَشْرُ –أَيْ اَلْعَشْرُ اَلْأَخِيرُ مِنْ رَمَضَانَ- شَدَّ مِئْزَرَهُ, وَأَحْيَا لَيْلَهُ, وَأَيْقَظَ أَهْلَهُ ] مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ**

واتە: (کاتێك داخیلی دە ڕۆژی کۆتایی مانگی ڕەمەزان دەبوو پێغەمبەری خوا – صلی الله علیه وسلم- خۆی توندوتۆڵ دەکردەوە، شەوەکانی زیندوو دەکردەوە، خێزانەکانی بەخەبەر دەیهێنا).

تاوەکو پێغەمبەری خوا – صلی الله علیه وسلم- وەفاتی کرد هەر بەم شێوەیە مایەوە، بەهەمان شێوە لە سەردەمی خەلافەتی ئیمامی ئەبو بەکر بەردەوام بوو، ماوەیەکیش لەسەر دەمی ئیمامی عومەر بەم شێوەیە بوو – ڕەزای خوای گەورەیان لێبێت-

لە فەرموودەی دووەمدا کە (عمرو بن مرة الجهني) ڕەزای خوای گەورەی لێبێت- دەفەرموێت: پیاوێ لە (قضاعة) ەوە هات بۆ لای پێغەمبەی خوا – صلی الله علیه وسلم- و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا من شەهادە بهێنم کە هیچ خوایەکی بەحەق نییە بێجگە لە خوای گەورەو شایەتی بدەم کە تۆ پێغەمبەر خوای، وە پێنج نوێژە فەرزەکان بکەم و، ڕۆژانی ڕەمەزان بەڕۆژوو بم و شەوەکانی نوێژو عیبادەت بکەم و، زەکاتیش لە ماڵەکەم دەرکەم؟ پێغەمبەری خوا – صلی الله علیه وسلم – فەرمووی: **[ من مات على هذا كان من الصديقين و الشهداء] (اخرجه ابن خزيمة وابن حبان في صحيحيهما وغيرهما في صحيحيهما).** واتە: ( هەرکەسێ لەسەر ئەوە بمرێ هاوشانی ڕاستگۆیان و شەهیدانە).

دەڵێم: ئەو دوو فەرمودەیەی شێخی ئەلبانی هێناونیەتەوە وەك بەڵگە کە پێغەمبەر خوا – صلی الله علیه وسلم- ڕەزامەندی دەربڕیوەو هاوەڵانی هانداوە کە نوێژی تێدا بکەن و ئەو شەوانە زیندوو بکەنەوە بە عیبادەت.

شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێت- بەردەوام دەبێ و دەفەرموێ: ((نوێژکردن بە کۆمەڵ (نوێژی تەڕاویح) لە ڕەمەزاندا کارێکی شەرعی و ڕێگە پێدراوە، بەڵکو خێرو

فەزڵی زۆر زیاترە وەك لەوەی کەسێك خۆی بە تەنها نوێژ بکات، چونکە پێغەمبەری خوا – صلی الله علیه وسلم- خۆی ئەو نوێژەی بە کۆمەڵ ئەنجام داوەو فەزڵەکەشی ڕونکردۆتەوە، وەك لە فەرموودەکەی (ابي ذر) ڕەزای خوای لێبێت- دەفەرموێت: **صمنا مع رسول الله -صلى الله عليه وسلم – رمضان، فلم يقم بنا شيئا من الشهر، حتى بقي سبع فقام بنا حتى ذهب ثلث الليل فلما كانت السادسة لم يقم بنا، فلما كانت الخامسة قام بنا حتى ذهب شطر الليل، فقلت: يا رسول الله لو نفلتنا قيام هذه الليلة، فقال: ( ان الرجل اذا صلى مع الامام حتى ينصرف حسب له قيام ليلة).**

**فلما كانت الرابعة لم يقم، فلما كانت الثالثة( يعني ليلة سبع وعشرين) جمع اهله ونساءه والناس، فقام بنا حتى خشينا ان يفوتنا الفلاح. قال: قلت: ما الفلاح؟ قال: السحور، ثم لم يقم بنا بقية الشهر) (حديث صحيح، اخرجه اصحاب السنن وغيرهم، مخرج في صلاة التراويح لاپەڕە ١٦،١٧- وصحيح ابي داوود ١٢٤٥، والارواء ٤٤٧).**

هۆکاری بەردەوام نەبوونی پێغەمبەری خوا – صلی الله علیه وسلم – لەسەر نوێژی بە کۆمەڵ لە تەواوی مانگی ڕەمەزاندا لە ترسی ئەوە بووە کە شەونوێژ لە مانگی ڕەمەزان فەرز نەبێت، وەك لە فەرموودەکەی عائیشە –ڕەزای خوای لێبێت – لە صەحیحەیندا هاتووە، بەڵام دوای وەفاتی پێغەمبەر و – صلی الله علیه وسلم- تەکمیلە بوونی شەریعەت ئەو مەترسییە کۆتایی هات، کە وازهێنانە لە نوێژی بە کۆمەڵ لە مانگی ڕەمەزاندا، حوکمەکەی بەم شێوەیە مایەوە کە کارێکی مەشروع و ڕێگە پێدراوە، هەربۆیە دواتر ئیمامی عومەر- ڕەزای خوای لێبێت – بە کۆمەڵ کردنی ئەم نوێژەی زیندوو کردەوە وەك لە صەحیحی بوخاری و غەیری ئەویشدا هاتووە.

ڕێگە دراوە ئافرەتانیش ئامادە بن وەك لە فەرموودەکەی (ابي ذر) هاتووەو، جائیزیشە ئیمامێکی تایبەتیان بۆ دابندرێت، جیا لە ئیمامی پیاوان. بێگومان لە ئیمامی عومەرەوە – ڕەزای خوای لێبێت – سابت بووە کاتێك خەڵکی کۆ دەکردەوە بۆ نوێژی بە کۆمەڵ، بۆ پیاوان ( ابي بن كعب) و بۆ ئافرەتانیش ( سليمان بن ابي حثمة) بە پێش نوێژ دادەنا.

عرفجة الثقفي دەفەرموێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب – ڕەزای خوای لێبێت – ئەمری بەخەڵکی دەکرد بە زیندووکردنەوەی ئەو شەوانە و ئیمامێکی بۆ پیاوان و یەکێکی بۆ ئافرەتان دەستنیشان دەکرد، دەفەرموێ: من (عرفجة الثقفي) ئیمامی ئافرەتەکان بووم. (اخرجه البيهقي ٤٩٤/٢).

## - ژمارەی ڕکاتەکانی

ژمارەیان یازدە ڕکاتە، لەوە زیاتر نەکرێ و دەست بگیرێ بە سوننەتی پێغەمبەرەوە – صلى الله عليه وسلم- گرنگترە لە کارێك کە ئەو ئەنجامی نەدابێت، لە فەرمودەکەی خاتوو عائیشە – رضي الله عنها – فەرمووی: **[ ما كان رسول الله - صلى الله عليه وسلم- يزيد في رمضان ولا في غيره على احدى عشرة ركعة، يصلى اربعا فلا تسال عن حسنهن وطولهن، ثم يصلي اربعا فلا تسال عن حسنهن وطولهن، ثم يصلي ثلاثا] (اخرجه الشيخان وغيرهما، وهو مخرج في صلاة التراويح ٢٠،٢١- وصحيح ابي داوود ١٢١٢).** واتە: نەبووە پێغەمبەی خوا- صلى الله عليه وسلم- لە ڕەمەزان و غەیری ڕەمەزان لە یازدە ڕکات زیاتر بکات، چوار ڕکاتی دەکرد هەر مەپرسە لە جوانی و درێژی ڕکاتەکانی، دواتر چوار ڕکاتی تری دەکرد هەر مەپرسە لە جوانی و درێژی نوێژەکانی، دواتر سێ ڕکاتی دەکرد).

بەڵام دەتوانێ ژمارەی ڕکاتەکەنی کەم بکاتەوە بە پێچەوانەی لێ زیاد کردنەکە، چونکە لە کردەوەی پێغەمبەرەوە – صلى الله عليه وسلم – وەرگیراوەو بەم شێوەیەی کردووە، دەتوانێ بە تەنها یەك ڕکات نوێژی ویترەکەش بێت بیکات.

کاتێك پرسیاریان لە خاتوو عائیشە کرد – ڕەزای خوای لێبێت – **بكم كان رسول الله – صلى الله عليه وسلم- يوتر؟ قالت: كان يوتر باربع.. (رواه ابو داود واحمد وغيرهما وهو حديث جيد الاسناد، وصححه العراقي وهو مخرج في صلاة التراويح لاپەڕە ٩٨،٩٩، وصحيح ابي داوود ١٢٣٣).**

**...وثلاث، وست وثلاث، وعشر وثلاث، ولم يكن يوتر بانقص من سبع، ولا باكثر من ثلاث عشرة] ( رواه الطحاوي والحاكم وغيرهما).**

لە وەڵامدا فەرمووی: بە چوار ڕکات، وە سێ ڕکات، شەش و دواتر سێ ڕکات، یا دە دواتر سێ ڕکات نوێژی ویتری کردووە، بە حەوت ڕکات کەمتر ویتری نەکردووە، وەك چۆن لە سێزدەی زیاتر نەکردووە.

## - چی دەخوێندەوە لە نوێژەکاندا؟

زۆر دیاری نەکراوە چەندی تێدا بخوێنێ، بەڵام ئەوەی وارید بووە کە هەندێك جار زۆر دوورودرێژی کردۆتەوەو هەندێك جاری تریش کورتی کردۆتەوە، جار هەبووە بە ئەندازەی سوڕەتی **{ يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ }** کە بیست ئایەتە خوێندوویەتەوە، وە هەندێك جاری تر بە ئەندازەی پەنجا ئایاتی خوێندۆتەوە.

دەیفەرموو – صلى الله عليه وسلم -: [ ئەوەی لە هەر شەوێکدا سەد ئایەت لە نوێژدا بخوێنێ لە غافڵان نانوسرێت] لە شوێنێکی تردا فەرمووی: [ دووسەد ئایەت بخوێنێ لە قانیت و موخڵیسەکان دەنوسرێت].

لە شەوێکدا کە نەخۆش بووە، حەوت سورەتە درێژەکەی بەدوایەکدا خوێندووە کە سورەتی (البقرة، ال عمران، النساء، المائدة، الانعام، الاعراف، التوبة) دەگرێتەوە.

سوننەتە لە سێ ڕکاتەکانی نوێژی ویتر سورەتی **{ سبِّح اسمَ رَبِّك الأَعْلى }** و لە ڕکاتی دووەم **{ قُلْ يَا أَيّهَا الْكَافِرُونَ }** و لە ڕکاتی سێیەم **{ قُلْ هُوَ اللّهُ أَحَد }** و هەندێك جارانیش **{قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ }** و **{ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ }** بخوێنێت.

هەروەك لە پێغەمبەرەوە – صلى الله عليه وسلم- وارید بووە لە ڕکاتی ویترەکەدا سەد ئایەتی لە سورەتی ( النساء) خوێندووە. (رواه النسائي واحمد بسند صحيح).

وە لە فەرموودەکەی حوذەیفەی کوڕی یەمانی – ڕەزای خوای گەورەی لێبێت- کاتێك لەگەڵ پێغەمبەری خوا – صلى الله عليه وسلم- نوێژ دەکات، دەفەرموێ: لە یەك ڕکاتدا سورەتی (البقرة، النساء، ال عمران) ی خوێند، دەفەرموێ: **كان يقرؤها مترسلا متمهلا**.

ئیمامی عومەر ڕەزای خوای لێبێت کاتێك فەرمانی بە (ابي بن كعب) دەکرد نوێژ بۆ خەڵکی بکات بە یازدە ڕکات، ئەویش دوو سەد ئایەتی بۆ دەخوێندنەوە، ئەوانی لە دوایەوە نوێژییان دەکرد لە درێژی نوێژەکە کەڵکیان لە قەدی دارەکان وەردەگرت تاوەکو خۆیان ڕابگرن، تەواو نەدەبوون تەنها بە کەمێك پێش سەرلەبەیانی نەبێت ( رواه مالك بنحوه، سەیری (صلاة التراويح) بکە لاپەڕە ٥٢).

هەروەها ئیمامی عومەر – ڕەزای خوای گەورەی لێبێت- قورئانخوێنەکانی کۆ کردەوەو فەرمانی پێکردن خێراترین قورئان خوێندنیان سی ئایەت بێ و ناوەڕاستەکەی بیست و پێنج و هێواشترینیان بیست ئایەت بێت( قيام رمضان/ للالباني لاپەڕە، ٢٥).

بەم شێوەیە بێت کاتێك پێشنوێژ بۆ خەڵکی دەکات، بەڵام ئەوکاتەی بە تەنیایە هەرچەندێکی پێی خۆشە با نوێژەکە و قورئانخوێندنەکەی درێژ کاتەوە.

پێغەمبەری خوا – صلى الله عليه وسلم – دەفەرموێت: **[ اذا قام احدكم للناس فليخفف الصلاة، فان فيهم [ الصغير] والكبير وفيهم الضعيف، [والمريض]، [وذا الحاجة]، واذا قام وحده فليطل صلاته ما شاء] (اخرجه الشيخان)**

واته: ( ئەگەر یەکێك لە ئێوە پێشنوێژی بۆ خەڵکی کرد با نوێژێکەی  خەفیف بکات، چونکە بێگومان خەڵکی منداڵ و بەتەمەن و لاوازو نەخۆش و کەسی مەشغوڵ و بەپەلەیان تێدایە، ئەگەر بەتەنیا نوێژی کرد ئەوەندەی پێی خۆشە با درێژی بکاتەوە).

## - کاتی نوێژی ویتر

لە دوای نوێژی خەوتنان (صلاة العشاء) دەستپێدەکات تاوەکو نوێژی بەیانی، پێغەمبەر خوا – صلى الله عليه وسلم – دەفەرموێت: **[ ان الله زادكم صلاة، وهي الوتر، فصلوها بين صلاة العشاء الى صلاة الفجر] (حديث صحيح، اخرجه احمد وغيره عن ابي بصرة، وهو مخرج في الصحيحة ١٠٨، والارواء ١٥٨/٢).** واتە: ( بێگومان خوای گەورە نوێژێکی تری بۆ زیاد کردوون کە ویترە، ئەویش لە نێوان نوێژی خەوتنان و نوێژی بەیانی بکەن).

## - چۆنیەتی نوێژی ویتر

١. سێزدە ڕکات نوێژ دەکات؛ بە دوو ڕکاتی خەفیف دەستپێدەکات کە دوو ڕکاتی دوای نوێژی خەوتنانە، یان دوو ڕکاتی تایبەت بە  شەونوێژ دەستپێبکات وەك لە پێشدا باسکراوە، دواتر دوو ڕکاتی زۆر درێژ دەکات، ئینجا دوو ڕکاتی خەفیف، دواتر دوو ڕکاتی درێژ، لەپاشان دوو ڕکاتی خەفیف، دواتر دوو ڕکاتی درێژ، ئینجا بە یەك ڕکات ویترەکەی دەکات.

٢. سێزدە ڕکات نوێژ دەکات؛ هەشت لەو سێزدانە دوو ڕکات دوو ڕکات دەکات و دوای هەردوو ڕکاتێك سەلام دەداتەوە، دواتر پێنج ڕکاتەکەی تر بەیەکەوە دەکات، نە جەلسەی تەشەهود دەخوێنێ نە سەلام دەداتەوە تەنها لە ڕکاتی پێنجەم بۆ جەلسەی تەشەهود دادەنیشێ و دواتر سەلام دەداتەوە.

٣. یازدە ڕکات نوێژ دەکات؛ تاوەکو دەیەمین ڕکات دوو ڕکات دوو ڕکات نوێژەکانی دەکات، وەك هەر نوێژێکی ئاسایی بۆ جەلسەی تەشەهود دادەنیشێ وسەلامیش دەداتەوە، یەك ڕکات دەمێنێ ئەویش بە ویتر دەکات.

٤. یازدە  ڕکات نوێژ دەکات؛ دوو جار چوار ڕکات چوار ڕکات نوێژەکان دەکات، دواتر ویترەکە بە سێ ڕکات دەکات.

٥. یازدە ڕکات نوێژ دەکات؛ هەشتیان بەسەریەکەوەو تەنها لە ڕکاتی هەشتەم جەلسەی تەشەهود دادەنیشێ و دواتر سەلام دەداتەوە و ئینجا ڕکاتێك نوێژی ویتر دەکات، هەر بە دانیشتنەوە دوو ڕکات دوای نوێژە ویترەکە دەکات.

٦. نۆ ڕکات نوێژ دەکات؛ شەشیان بە سەریەکەوەو تەنها لە ڕکاتی شەشەم بۆ جەلسەی تەشەهەود دادەنیشێ و دواتر سەلام دەداتەوە، ئینجا یەك ڕکاتی ویترەکی دەکات و، هەر بە دانیشتنەوە دوو ڕکاتی تر دەکات.

ئەو چەند شێوازەن کە وارید بوون لە پێغەمبەری خواوە – صلی الله علیه وسلم – باشتر وایە بۆ هەرکەسێك کە لە ڕەمەزاندا دەیەوێ ئەنجامیان بدات و نوێژە تەراویحەکانی بکات پێیانەوە پابەند بێت و زیاد و کەمیان نەکات و لە سوننەتی پێغەمبەر –صلی الله علیه وسلم- لا نەدات.

## - دوعای قنوت

دوعای قنوت دوای خوێندنی ئایەتەکان و پێش چوونە ڕکوعەوەیە، هەورەك پێغەمبەری خوا – صلی الله علیه وسلم- حەسەن و حوسەینی ئاوا فێرکردووە – ڕەزای خوایان لێبێت–

دوعایەکەش بەم شێوەیە دەبێت:- **[ اللهم اهدني فمن هديت، وعافني فيمن عافيت، وتولني فيمن توليت، وبارك لي فيما اعطيت، وقني شر ما قضيت، فانك تقضي ولا يقضى عليك، وانه لايذل من واليت، ولا يعز من عاديت، تباركت ربنا وتعاليت، لا منجا منك الا اليك] (اخرجه ابو داوود النسائي وغيرهما بسند صحيح).**

هەندێ جارانیش سەڵات و سەلام لەسەر پێغەمبەری خوا – صلی الله علیه وسلم – لێ دەدات.

ئاساییە ئەگەر دوعای قنوتەکەی بخاتە دوای هەستانەوە لە ڕکوعەوەو هەمان دووعای سەرەوە دەخوێنێ و، نەفرین و لەعنەت بۆ کافران بنێرێ و، سەڵەوات لەسەر پێغەمبەر- صلی الله علیه وسلم- لێ بدات و داوای خێر بۆ موسوڵمانان بکات...

# تەوەرەباسی سێیەم: شەوی قەدر (ليلة القدر)

## - گەورەیی شەوی قەدر

خوای گەورە دەربارەی گەورەیی شەوی قەدر دەفەرموێ: **{ إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ (١) وَمَا أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ (٢) لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ (٣) تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ (٤) سَلَامٌ هِيَ حَتَّى مَطْلَعِ الْفَجْرِ} سورة القدر**

شەوی قەدر لە پیرۆزترینی شەوەکانی ڕەمەزانە، خوای گەورە لەو شەوە موبارەکەدا قورئانی پیرۆزی نازڵ کردووەو عیبادەت کردن لەو شەوە خێری زیاتری هەیە لە هەزار مانگی ئاسایی کە عیبادەتی تێدا دەکەین.

پێغەمبەری خوا –صلی الله علیه وسلم – دەربارەی گەورەیی و خێرو فەزڵی ئەم شەوە موبارەکە دەفەرموێت: **[ من قام ليلة القدر[ ثم وفقت له]، ايمانا واحتسابا، غفر له ما تقدم من ذنبه]** **( اخرجه الشيخان، واحمد ٣١٨/٥)** کە ئەگەر خوای گەورە بە نسیبی هەریەك لە بەندەکانی بکات، بێگومان دەیکاتە مایەی شۆردنەوەو هەڵوەرینی گوناحەکانی و پاکی دەکاتەوە، بۆیە زۆر گرنگە ئەو کاتانە لە کیسی خۆمانی نەدەین هەوڵ بدەین جوهدێکی زۆری تێد بکەین. خوای گەورە بە نسیبی هەمووومانی بکات. اللهم آمین.

شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرموێ: ڕای ئەرجەح ئەوەیە کە شەوی قەدر دەکەوێتە شەوی بیست و حەوتی ڕەمەزانەوە، لەوبارەشەوە چەند ئەسەرێکی هێناوەتەوە کە پێغەمبەر خوا –صلی الله علیه وسلم – فەرمانی بە هاوەڵان کردووە بە عیبادەت کردن لەو شەوە موبارەکەدا (اخرجه مسلم وغيره، صحيح ابي داوود ١٢٤٧).

**- نزاوپاڕانەوە لە شەوی قەدر**

هەر دوعایەك بخوێنێ جائیزە، بەڵام باشتر وایە ئەو دوعایە دووبارە بکاتەوە کە پێغەمبەری خوا – صلی الله علیه وسلم- فێری (عائیشة) ی کردووە.

**وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: [ قُلْتُ يَا رَسُولَ اَللَّهِ : أَرَأَيْتَ إِنْ عَلِمْتُ أَيَّ لَيْلَةٍ لَيْلَةُ اَلْقَدْرِ, مَا أَقُولُ فِيهَا؟ قَالَ: " قُولِي: اَللَّهُمَّ إِنَّكَ عَفُوٌّ تُحِبُّ اَلْعَفْوَ فَاعْفُ عَنِّي " ] رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ, غَيْرَ أَبِي دَاوُدَ, وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ, وَالْحَاكِمُ**

واتە: ( وتم ئەی پێغەمبەری خوا : باشە ئەگەر زانیم کامە شەوە شەوی قەدرە، چی بڵێم لەو شەوە؟ فەرمووی بڵێ: **اَللَّهُمَّ إِنَّكَ عَفُوٌّ تُحِبُّ اَلْعَفْوَ فَاعْفُ عَنِّي** )

## تەوەرەباسی چوارەم: خەڵوەتگرتن (الاعتكاف)

چوونە خەڵوەتەوە بە مەبەستی خواپەرستی لە ڕەمەزان و غەیری ڕەمەزانیش سوننەتە، مەشروعیەتی خەڵوەتیش لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە باسی کردوو و چەندین فەرموودە لە پێغەمبەری خواوە- صلی الله علیه وسلم- ڕیوایەت کراوە کە چۆتە خەڵوەتەوە. وارید بووە کە لە کۆتایی مانگی شەووالدا ئیعتیکافی کردووە، وە ئیمامی عمر – رضی الله عنه – دەفەرموێت: لەسەردەمی جاهیلی لەسەر خۆمم نەزر کردبوو شەوێك لە (المسجد الحرام) بچمە خەڵوەتەوە، دەفەرموێ: ئەوەم بە پێغەمبەری خوا ڕاگەیاند صلی

الله عليه وسلم- ئەویش لەوەڵامدا فەرمووی: **{أَوْفِ بِنَذْرِكَ}** ئیمامی عمر دەفەرموێ: منیش فەرمانەکەیم بەجێ گەیاند. ئەو دوو بەڵگەیە ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە لە غەیری ڕەمەزانیشدا خەڵوە سوننەتە، وە ئەگەر نەزری کردبێ واجبە و دەبێ بەجێی بگەیەنێ ئەگەرنا تاوانبار دەبێت.

بەڵام لە ڕەمەزاندا سوننەتێکی بەردەوامی (سنة مؤكدة) بووە بەپێی ئەو فەرموودانەی دەربارەی ئەو مەسەلەیە هاتوون.

**عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: [ كان النبي صلى الله عليه وسلم يعتكف في كل رمضان عشرة أيام فلما كان العام الذي قبض فيه اعتكف عشرين يوماً] (رواه البخاري)**

واتە: ( پێغەمبەری خوا – صلی الله علیه وسلم – هەموو ڕەمەزانان دە ڕۆژ ئیعتیکافی دەکرد، بەڵام ئەو ساڵەی کە وەفاتی تێدا کرد، بیست ڕۆژان ئیعتیکافی کرد).

باشترینیشیان دە ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزانە چونکە ئەگەری زۆری هەیە بەر شەوی قەدر بکەوێ، کە عیبادەتکردن تێیدا خێری باشترە لە هەزار مانگ کە پێشتر لە تەوەرە باسی سێیەمدا باسکراوە. ئەوەش لەفەرمووودەدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم- بەردەوام لە دە ڕۆژی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا خەڵوەتی گرتووە، تەنها ئەو ساڵەی لێدەرچێ کە وەفاتی تێدا کرد ئەوێ ساڵێ بست ڕۆژانی خەڵوەت گرت.

**- مەرجەکانی ئیعتیکاف**

١. دەبێ تەنها لە مزگەوت بێت، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: **{ وَأَنتُمْ عَكِفُونَ فِى الْمَسَاجِدِ }**

دایکی بڕواداران خاتوو عائیشە- رضی الله عنها- دەفەرموێت: سوننەت وایە ئەوکەسەی لە خەڵوەتە، لە خەڵوەتگاکەی دەرنەچێت، تەنها بۆ حاجەتێك نەبێت کە هیچ مەجالی تێدانییە هەردەبێ بۆی بڕوات، نابێ سەردانی نەخۆش بکات، بۆ جەنازە ناشتن نەچێ، وە دەست لە خێزانەکەی نەدات یا سەرجێی لەگەڵدا بکات، ئیعتیکافیش نییە تەنها لە مزگەوتێك کە جەماعەتی تێدا دەکرێت، سوننەتیش وایە کە چووە خەڵوەتەوە بەڕۆژوو بێت) رواه البيهقي بسند صحيح، وابو داود بسند حسن، صحيح ابي داود٢١٣٥، و (الارواء ٩٦٦).

**{ اَلسُّنَّةُ عَلَى اَلْمُعْتَكِفِ أَنْ لَا يَعُودَ مَرِيضًا, وَلَا يَشْهَدَ جِنَازَةً, وَلَا يَمَسَّ امْرَأَةً, وَلَا يُبَاشِرَهَا, وَلَا يَخْرُجَ لِحَاجَةٍ, إِلَّا لِمَا لَا بُدَّ لَهُ مِنْهُ, وَلَا اعْتِكَافَ إِلَّا بِصَوْمٍ وَلَا اعْتِكَافَ إِلَّا فِي مَسْجِدٍ جَامِعٍ } رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ**

دەبێ لە مزگەوتێك بێ كە نوێژی جومعە و جەماعەتی تێدا بكرێ و پێویست نەكات بچێتە دەرەوە بۆ مزگەوتێكی تر، چونكە نوێژی جومعە فەرزەو نابێ پشتگوێی بخات.

شێخی ئەلبانی ڕەزاو ڕەمەتی خوای گەورەی لێبێت لێرەدا دوو خاڵ ڕوون دەكاتەوە:-

١. قەولێكی ئیبنو عەبباسی هێناوەتەوە كە بەیهەقی ڕیوایەتی كردووە – ڕەزاو ڕەحمەتی خوای پەروەردگارییان لێبێت – دەفەرموێت: **(ان ابغض الامور الى الله البدع، وان من البدع الاعتكاف في المساجد التي في الدور) (قيام رمضان/ الالباني - لاپەڕە ٣٦)**

واتە: ( خراپترینی ئەو شتانەی كە خوای گەورە ڕقی لێیەتی بیدعە و داهێنراوە، لە نێوان ئەو داهێنراوانەش خەڵوەگرتنە لەو مزگەوتانەی لە ماڵەكاندا هەن)

زۆر ماڵ هەیە ژوورێكی تایبەتی داناوە بۆ نوێژ و عیبادەتی شەخسی خۆی و ناوی لێناوە مزگەوتی نێو ماڵ، خەڵوەگرتن لەو جۆرە مزگەوتانە جائیز نییە و بە خەڵوەتیش حیساب ناكرێت، بەڵكو تەنها بیدعەیەكە نە زیاتر.

٢. شێخی ئەلبانی - ڕەزاو ڕەحمەتی خوای پەروەردگاری لێبێت- دەفەرموێ: دوای هەڵوەستەیەك لەسەر ئەو فەرمووده سەحیح و سەریحەی مزگەوتەكانی دەستنیشان كردووە، كە سێ مزگەوتن ( المسجد الحرام) و (المسجد النبوي) و (المسجد الاقصى) لەفەرموودەی پێغەمبەردا – صلى الله عليه وسلم- كە دەفەرموێت: **[ لا اعتكاف الا في المساجد الثلاثة ]** (اخرجه الطحاوي والاسماعيلي والبيهقي باسناد صحيح عن حذيفة ابن اليماني- رضى الله عنه- وهو مخرج في (الصحيحة – ژمارە ٢٧٨٦).

ئینجا دەفەرموێ: وەك ئەوەی بەرچاوی من كەوتووە ژمارەیەك لە ئەهلی سەلەف وەك (حذيفة بن اليماني، سعيد بن المسيب، عطاء) وایان فەرمووە، بەڵام ئەو باسی مزگەوتی قودسی نەكردووە....)

بێگومان ڕا جوێی تێدایە باسەكە هەندێك لە غەیری ئەو سێ شوێنەش بە جائیزیان زانیوە، بەڵام گومانی تێدا نییە پابەند بوون بە فەرموودەكە و هاوڕایی بوون لەگەڵی دەبێ دەستی پێوە بگیرێ و وەربگیرێت.

وە بەڕۆژوو بوون لە كاتی خەڵوەتدا لە سوننەتی پێغەمبەری ئەكرەمە – صلى الله عليه وسلم – وەك لە فەرموودەكەی دایكی بڕواداران پێشتر باسكراوە.

### - ئەو كارانەی ڕێ پێدراون لە كاتی خەڵوەتدا

١. بۆ حاجەتێك دەتوانێ دەرچێتە دەرەوە وەك ئەوەی سەری بەرێتە دەرەوە تاكو بۆی بشۆن، دایكە عائیشە ڕەزای خوای لێبێت دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا –صلى الله عليه

وسلم – سەری (موبارەکی) دەهێنایە ئەو دیوی حوجرەکەی منەوە (مزگەوتەکە و حوجرەکەی عائیشە -رضی الله عنها - تەنها دەرکۆڵەیەکی بچوکی لە نێواندا بووە) سەریم بۆ ڕێك دەخست. لەڕیوایەتێکی تردا سەریم بەمدا دەشوشت لەکاتێکدا من لە (حەیز) دا بووم، نەدەهاتە ماڵەوە تەنها بۆ حاجەتێکی مرۆیی خۆی نەبێت)). (رواه الشیخان، وابن ابي شيبة، واحمد، سەیری (صحيح ابي داود – ٢١٣١ و ٢١٣٢) بکە.

**[ إِنْ كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ ﷺ لَيُدْخِلُ عَلَيَّ رَأْسَهُ -وَهُوَ فِي اَلْمَسْجِدِ- فَأُرَجِّلُهُ, وَكَانَ لَا يَدْخُلُ اَلْبَيْتَ إِلَّا لِحَاجَةٍ, إِذَا كَانَ مُعْتَكِفًا ] مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ, وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ.**

٢. دەتوانێ لەو مزگەوتەی خەڵوەتی تێدا کردووە دەستنوێژ هەڵبگرێت، پیاوێك کە خزمەتکاری پێغەمبەری کردووە – صلى الله عليه ەسلم- دەفەرموێ: پێغەمبەر –صلى الله عليه وسلم – لە مزگەوتەکەدا دەستنوێژێکی سوکەڵەی هەڵگرت.

٣. دەشتوانێ لە سوچێکی مزگەوتەکە بۆ نمونە لە دواوە شوێنێکی بە پەناوە بێت خێمەیەکی بچکۆڵە بۆخۆی هەڵدا، دەفەرموێ خاتوو عائیشە رضي الله عنها – بەفەرمانی پێغەمبەر (خیباء)ی بۆ هەڵدەدا. (خیباء) یش پارچە پەشتەماڵ یان پارچە صوفێکە بەڵام نابێ مواوی بێ (وەك پێستەی بزن و مانگا و...) بەسەر دوو یان سێ عەموودانی هەڵدەدا.

جارێکیان لە ژێر قوببەیەکی بچوك خەڵوەتی کردووە کە بە حەسیر داپۆشراوە.

٤. خێزانەکەی دەتوانێ سەردانی بکات و لەلای بمێنێتەوە، پیاوەکەش بەهەمان شێوە دەتوانێ تاوەکو بەردەرکی مزگەوت بەڕێی بکات.

خێزانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا –صلى الله عليه وسلم (صفية) ڕەزای خوای لێبێت دەفەرموێت:**[ كان النبي معتكفا في المسجد في العشر الاواخر من رمضان فاتيته ازوره ليلا..] اخرجه الشيخان، وابو داود (صحيح ابي داود ٢١٣٣،٢١٣٤)**. واتە: ( لە دە ڕۆژی کۆتایی مانگی ڕەمەزان پێغەمبەری خوا – صلى الله عليه وسلم – لە مزگەوتێ خەڵوەی کردبوو، منیش بە شەو سەردانم دەکرد).

ئافرەت بۆی هەیە لەگەڵ پیاوەکەی یا خۆی بە تەنها خەڵوەت بگرێ، وەك لە وتەکەی خاتوو عائیشە –رضي الله عنها – دەفەرموێت: **[ اعتكفت مع رسول الله امراة مستحاضة، [ ام سلمة ] فكانت ترى الحمرة والصفرة، فربما وضعنا الطست تحتها وهي تصلى ] رواه البخاري ، صحيح ابي داود ٢١٣٨)**

لە ڕیوایەتێکی تردا **[ أَنَّ اَلنَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَعْتَكِفُ اَلْعَشْرَ اَلْأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ, حَتَّى تَوَفَّاهُ اَللَّهُ, ثُمَّ اعْتَكَفَ أَزْوَاجُهُ مِنْ بَعْدِهِ ] مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ** واتە: ( پێغەمبەری خوا – صلى الله عليه وسلم

– تا ئەوكاتەی وەفاتی كرد لە دە شەوی كۆتایی ڕەمەزان خەڵوەتی دەگرت، دوای ئەو خێزانەكانی ئیعتیكافییان دەكرد).

شێخی ئەلبانی - ڕەحمەتی لێبێت- ڕوونكردنەوەیەك دەدا و دەفەرموێت: ئەو فەرمودەیە بەڵگەیە لەسەر جائیزی خەڵوەتی ئافرەتان، بەڵام گومانی تێدا نییە دەبێ بە ئیزن خواستنی سەرپەرشتیارەكانیان بێت، وە ئەمین بن لە فیتنە و تێكەڵ بوون لەگەڵ پیاوان، بەڵگەش لەسەر ئەوە زۆرە، بنچینە فقهییەكەش دەڵێ: ( درء المفاسد مقدم على جلب المصالح).

بەڵام، جیماعی نێوان پیاو و ژن ئیعتیكاف بەتاڵ دەكاتەوە، چونكە خوای گەورە دەفەرموێت: **{ وَلاَ تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ } البقرة: ١٨٧**

ئیبنو عەبباس – ڕەزای خوایان لێبێت – دەفەرموێ: **(( اذا جامع المعتكف بطل اعتكافه، واستانف)) رواه ابن ابي شيبة (٩٢/٣) وعبدالرزاق (٣٦٣/٤) بسند صحيح.**

واتە:( ئەگەر ئەوكەسەی ئیعتیكاف دەكا جیماعی كرد، خەڵوەتەكەی هەڵدەوەشێتەوەو، دەبێ سەرلەنوێ ئیعتیكافێكی نوێ دابەستێتەوە).

ئەگەر كەوتە ئەو حاڵەتەوە كەفارەتی ناكەوێتە سەر، چونكە هیچ شتێك لە پێغەمبەرەوە – صلى الله عليه وسلم – و هاوەڵانی – ڕەزای خوایان لێبێت – وارید نەبووە.

## تەوەرەباسی پێنجەم: زەكاتی سەرفترە (زكاة الفطر)

زەكات (الزكاة) لە زمانەوانییدا: بە مانای گەش و نوما دێت، وە بەمانای پاكبوونەوەش هاتووە، چونكە خاوەنی زەكاتەكە پاك دەكاتەوە، هەروەهاماڵەكەشی پاك دەكاتەوە لە حەرام و ئەوەی كە ماوەتەوە لە ماڵ و سامانەكەی گەشونمای پێدەكات.

خوای –تبارك وتعالى- دەفەرموێت: **{ قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا } الشمس: ٩**

سەرفترە(الفطر) لە كوردیدا سەرفترە لەبەرامبەر (زكاة الفطر) بەكار دەهێنرێت، بۆیە لێرەدا منیش هەمان شتم نوسیوەتەوە، ئەسڵی وشەكە لە خیلقە و فیترەتی مرۆڤەوە هاتووە، بەڵام لە شەرعدا بەمانای سەقەدەی لاشەی مرۆڤ دێت.

### - حوكمی زەكاتی سەرفرە

زەكاتی سەرفترە فەرزكراوە لەسەر گەورەو بچوك، نێر و مێ، ئازاد و بەندەی مسوڵمانان.

بەڵگەش لەسەر فەرزییەتەکەی ئایەت و فەرموودەن، خوای گەورە دەفەرمویێت: **{ قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا }** جێگیر بووە کە دەربارەی فەڕزییەتی زەکات دابەزیوە.

**عَنِ اِبْنِ عُمَرَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: [ فَرَضَ رَسُولُ اَللَّهِ ﷺ زَكَاةَ اَلْفِطْرِ, صَاعًا مِنْ تَمْرٍ, أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ: عَلَى اَلْعَبْدِ وَالْحُرِّ, وَالذَّكَرِ, وَالْأُنْثَى, وَالصَّغِيرِ, وَالْكَبِيرِ, مِنَ اَلْمُسْلِمِينَ, وَأَمَرَ بِهَا أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ اَلنَّاسِ إِلَى اَلصَّلَاةِ ] مُتَّفَقٌ عَلَيْه**

واتە: ( پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم – زەکاتی سەرفترەی فەڕز کردووە، ڕبەیەك لە خورما، یا ڕبەیەك لە جۆ؛ لەسەر عەبد یا ئازاد، نێر یا مێ، بچوك یا گەورە، لە مسوڵمانان، وە فەرمانی دەکرد کە زەکاتەکە بدرێت پێش چوون بەرەو نوێژ).

**وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: [ كُنَّا نُعْطِيهَا فِي زَمَانِ اَلنَّبِيِّ ﷺ صَاعًا مِنْ طَعَامٍ, أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ, أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ, أَوْ صَاعًا مِنْ زَبِيبٍ. ] مُتَّفَقٌ عَلَيْه**

واتە: ( لە سەردەمی پێغەمبەردا – صلى الله عليه وسلم – ڕبەیەك لە خواردن، یان لە خورما، یاخود لە جۆ، یان لە مێوژمان دەدا).

## - حیکمەتی زەکاتی سەرفترە

شێخ (ابن العثيمين) ڕەحمەتی خوای پەروەردگاری لێبێت – دەفەرموێت: دەربارەی حیکمەتی زەکاتی سەرفترە ڕوون و ئاشکرایە، چاکە و ئیحسان کردنە لەگەڵ فەقیرو هەژاران، تاوەکو لە ڕۆژی جەژندا داوای یارمەتی لە کەس نەکەن و ئەوانیش شانبەشانی دەوڵەمەندەکان بەشدای خۆشی و فەڕحەتی جەژن بکەن، بەم شێوەیەش هەموان لە خۆشی جەژن بەشدار دەبن.

وە مایەی پاکبوونەوەی ڕۆژوەوانیشە لە کەم و کورتی ڕۆژووەکانی و تاوان و وتەی ناشیاو لە کاتی بەڕۆژوو بووندا کردوویانە.

هەروەها، دەرخستنی شوکرانە بژێرییە بۆ خوای گەورە بە تەواو بوونی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان و زیندووکردنەوەی شەوەکانی، وە ئەمجامدانی کردەوەی چاکە تێیدا. (مجالس شهر رمضان/ ابن العثيمين/ لاپەڕە،٣٢٥).

**عَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: [ فَرَضَ رَسُولُ اَللَّهِ ﷺ زَكَاةَ اَلْفِطْرِ; طُهْرَةً لِلصَّائِمِ مِنَ اَللَّغْوِ, وَالرَّفَثِ, وَطُعْمَةً لِلْمَسَاكِينِ, فَمَنْ أَدَّاهَا قَبْلَ اَلصَّلَاةِ فَهِيَ زَكَاةٌ مَقْبُولَةٌ, وَمَنْ أَدَّاهَا بَعْدَ اَلصَّلَاةِ فَهِيَ صَدَقَةٌ مِنَ اَلصَّدَقَاتِ]رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ, وَابْنُ مَاجَهْ, وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِم**

### - جۆرەكانى زەكاتى سەرفترە

لەریوایەتەكەی (ابي سعيد الخدري) دەفەرموێ: **[ كُنَّا نُخْرِجُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ طَعَامٍ . وَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ : وَكَانَ طَعَامَنَا الشَّعِيرُ وَالزَّبِيبُ وَالْأَقِطُ وَالتَّمْرُ ] (رواه البخاري:١٥٠٨، مسلم: ٩٨٥).**

ئەو خواردنانە لەو سەردەمە قوتی ئادەمی بوون، لەم سەردەمە و لەو وڵاتە چی قوتی ئەو خەڵكە بێ دەشێ بدرێت لەبری ئەو جۆرە خواردنانەی لە فەرموودەكەدا هاتوون، وەك برینج و گەنمەشامی و ئارد و هاوشێوەی ئەوانەش، ئەمە وتەی زۆرینەی زانایانە.

بەڵام دەربارەی پارە بەشینەوە لەبری خواردن، جائیز نییە و هیچ شتێك لە بارەیەوە نەهاتووە، ئەگەرچی لە سەردەمی پێغەمبەردا – صلى الله عليه وسلم - پارە هەبووەو مامەڵەشی پێكراوەو خەڵكی پێوستیشیان پێی بووە، هەروەها هیچ كام لە هاوەڵانیش دەربارەی ئەوە لێیان نەبیستراوە قسەیان لەسەر كردبێ یان مامەڵەیان لەگەڵدا كردبێت.

ئەندازەكەشی لەم فەرموودەیەدا هاتووە كە دەبێ یەك ڕبە (صاع) بێت، شێخ (ابن العثيمين) - رحمه الله- ئەندازەی (صاع) ەكە بە دوو كیلۆو ڕوبعە كیلۆیەك دەخەملێنێ.

### - كاتی بەخشینەوەی زەكاتە

فەرزییەتەكەی دەكەوێتە كۆتا ڕۆژی ڕەمەزان لەگەڵ نوێژی خۆرئاوابوون، باشتر وایە لەنێوان نوێژی بەیانی و نوێژی جەژن زەكاتەكە بدرێت، ڕێگەش دراوە ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ پێش ئەوكاتە بدرێت، وەك هەندێك لە هاوەڵان – ڕەزای خوایان لێبێت – كردوویانە لە نێوان ئەوانەشدا عەبدوڵڵای كوڕی عومەر – ڕەزای خوای پەروەردگاریان لێبێت- (رواه البخاري في صحيحه ١٥١١).

كۆتا وەختی بەخشینەوەی زەكاتی سەرفترە، ئیبنو عومەر – ڕەزای خوایان لێبیت – دەربارەی ئەوە دەفەرموێ: **[امرنا رسول الله - صلى الله عليه وسلم – بزكاة الفطر ان تودى قبل خروج الناس الى الصلاة] صحيح سنن ابي داوود للالباني ١٤٢١).**

لەم فەرموودەیەدا ڕوون دەبێتەوە كۆتا وەختی دەركردنی زەكاتەكە پێش دەرچوونی خەڵكەكەیە بۆ نوێژی جەژن.

**- کۆکردنەوەی زەکاتەکە لەیەك شوێندا**

پێغەمبەری خوا – صلى الله عليه وسلم- کۆکردنەوەی زەکاتی سەرفترەی سپاردبوو بە هاوەڵی بەڕێزی (ابا هريرة) ڕەزای خوای گەورەی لێبێ، دەفەرموێ: **[ اخبرني رسول الله – صلى الله عليه وسلم – ان احفض زكاة رمضان] اخرجه البخاري.**

لەو فەرمودەیە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە کۆکردنەوەی زەکاتەکە نەك ڕێگە پێدراوە بەڵکو سوننەتیشە، دواتر دابەش دەکرێتەوە سەر ئەوکەسانەی زەکاتەکەیان پێدەشێت.

**- ئەو کەسانەی حەقی وەرگرتنی زەکاتی سەرفترەیان هەیە؟**

ئەو کەسانەی کە لە سوڕەتی تەوبە ناویان هاتووە بۆیان هەیە ئەو زەکاتە وەربگرن، تەنها ئەوانەیان نەبێت کە پێیان دەوترێت ( المؤلفة قلوبهم) لە کاتی خۆیدا تازە مسوڵمان بووەکان لە زەکات و غەنیمە بەشیان دەدرا بۆ دڵنەوایی کردنیان و شیرین کردنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەلای ئەو جۆرە کەسانە، بەڵام ئەوانە زەکاتی سەرفترە نایانگرێتەوە، هەروەها ئەوانەشیان ناگرێتەوە کە بە کۆکردنەوەو کاروباری ئەو زەکاتە هەڵدەستن، کە لە ئایەتەکە ناویان هاتووە بە **{ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا}.**

خوای گەورە دەفەرموێ: **{ إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ } التوبة: ٦٠** ئیبنو عوثەیمین – رحمه الله – دەفەرموێ: ئەوانەی موستەحەقی وەرگرتنی زەکاتی سەرفترەن فەقیرانن، وە ئەوانەش کە قەرزدارن و توانای ئەوەیان نییە قەرزەکانیان بدەنەوە، بە قەدەر پێویستیان بەش دەدرێن.

باشتر وایە هەریەکە بیدات بە خزمانی خۆی یاخود بە هاوسێ و ناسیاوەکانی لەوانە کە حەقی وەرگرتنی ئەو زەکاتەیان هەیە، بەم شێوە ئەگەر کەسێکی لەو شێوەی دەست نەکەوت ئینجا بیبەرێتەوە بۆ کەسانی دوورتر، چاکتریش وایە نەنێردرێتە دەرەوەی وڵات تا ئەوکاتەی کەسانێك لە ناوەوەی وڵات پێویستیان پێیەتی، ئەگەر ئەو جۆرە کەسانە نەبوون ئەوکاتە دەتوانێ بۆ هەر شوێنێکی تر ڕەوانەی بکات.

**- چۆنییەتی بەخشینەوەکەی**

ابن عثيمين – رحمه الله – دەفەرموێ: جائیزە زەکاتەکە دابەش بکرێت بەسەر چەند فەقیرێك، وە بە پێچەوانەشەوە دەکرێ چەند زەکاتێك کۆ بکرێتەوەو بدرێتە یەك هەژار، چونکە پێغەمبەر خوا – صلى الله عليه وسلم – واجیبەکەی دیاری کردووە نەك ئەو ئەندازەی پێی دەدرێت.(مجالس شهر رمضان صفحة ٢٣٢).

تێبینی: دەبێ لە باشترینی خواردنەکان ببەخشێ لەوەی کە بۆخۆی بە چاکی دەزانێ و لێی دەخوات.

خوات گەورە دەفەرموێ: **{ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقْنَاكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لاَّ بَيْعٌ فِيهِ وَلاَ خُلَّةٌ وَلاَ شَفَاعَةٌ وَالْكَافِرُونَ هُمُ الظَّالِمُونَ} البقرة: ٢٥٤**

**عن أبي هريرة قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: [ إن الله تعالى طيب لا يقبل إلا طيبا..] رواه مسلم**

## تەوەرەباسی شەشەم: چەند پرسیارو وەڵامێك دەربارەی زەكاتی سەرفترە.

چەند پرسیارو وەڵامێكە دەربارەی ڕۆژوو كە لە بابەتەكە باسیان نەهاتووەو ئەم پرسیارانە چەند بارەش دەبنەوە، كە لەلایەن شێخ (ابن العثيمين)ەوە وەڵام دراوەتەوە لە (مسائل هامة في زكاة الفطر).

**پرسیار**: ئایا كۆرپەڵە لە زكی دایكیدا، زەكاتی سەرفترەی لەسەرە؟

**وەڵام:** نەخێر لەسەری فەرز نییە، بەڵام ئەگەر بۆی بدرێت هیچی تێدا نییە و جائیزە.

**پرسیار**: ئایا دەكرێ زەكاتی سەرفترە بە پارە بدرێ؟

**وەڵام**: قیمەتی خواردنەكە بە پارە بدرێ پاداشتی نییە، چونكە پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەری خوایە – صلى الله عليه وسلم –

**پرسیار**: دەكرێ زەكاتی سەرفترە دوابخرێت بەهۆی عوزرێكەوە؟

**وەڵام**: ئەگەر عوزرێكی هەبێت، بەڵێ، بۆنمونە ئەگەر لە چۆڵەوانییەك بێ لەو كاتەشدا جەژنی بەسەردا دێت و كەسێكی دەست ناكەوێ زەكاتەكەی بداتێ، یا لە ناكاو هەواڵی جەژنی پێدەگات و فریا ناكەوێ زەكاتەكەی دەركات پێش نوێژی جەژن، یا خەڵكێكی ڕاسپاردووە زەكاتەی بۆ بدات، بەڵام ئەو كەسە لەبیری دەچێ، دەبێ زەكاتەی بدات ئەگەر دوای نوێژی جەژنیش بێ، چونكە عوزرێكی هەیە.

**پرسیار**: ئایا دەكرێ زەكاتی سەرفترە بۆ مردوو بدرێت؟

**وەڵام**: ئەگەر پێش نوێژی ئێوارە بمرێ تەنانەت بە چەند دەقیقەیەكیش بێت زەكاتی سەرفترەی لەسەر واجب نابێ، ئەگەر دوای نوێژی ئێوارە بمرێ ئەگەر تەنها بە چەند دەقیقەیەكیش بێ دەبێ زەكاتەكی بدرێ، ئەگەر منداڵ لە دوای نوێژی ئێوارە لەدایك بێ زەكاتی ناكەوێتە سەر.

**پرسیار**: ئایە دەكرێ كەسێك ڕاسپێرێ لەبری یەكێكی تر زەكاتە بدات؟

**وەڵام**: دەگونجێ كەسێكی تر زەكاتەكە بدات، بەڵام لە كاتی شەرعی خۆیدا بیدات و دوای نەخات.

**پرسیار**: ئایا فەقیرێك دەتوانێ زەكاتەكە وەربگرێ و لەبری زەكاتەكەی خۆی بیداتەوە بە فەقیرێكی تر؟

**وەڵام**: دەگونجێ ئەو كارە بكات، بەو مەرجەی دڵنیا بێت لەو بەشە زەكاتەی وەری گرتووە میقدارەكەی تەواو بێ و كەمتر نەبێ لەو ئەندازەی بۆ زەكاتەكە دیاری كراوە.

**پرسیار**: دەكرێ لە بری خواردن، جلوبەرگ یاخود ڕایەخ و قاپوقاچاخ بكرێتە زەكاتی سەرفترە؟

**وەڵام**: هیچ یەكێ لەوشتانەی باسكراون ناكرێ بدرێ لەبری خۆراك كە دەستنیشان كراوە لەلایەن پێغەمبەری خواوە – صلى الله علیه وسلم –

## تەوەرەباسی شەشەم: نوێژی جەژن ( صلاة عید الفطر)

پێغەمبەری خوا – صلى الله علیه وسلم- بە ئەبو بەكری فەرموو: **[ یا أبا بكرٍ إن لكلِّ قومٍ عیداً، وهذا عیدُنا ] متفق علیه.** واتە: (( ئەی ئەبا بەكر بێگومان هەموو قەومێك جەژنێكی خۆی هەیە، ئەوەش جەژنی ئێمەیە)).

**وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ ﷺ [ أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ صِيَامِ يَوْمَيْنِ: يَوْمِ اَلْفِطْرِ وَيَوْمِ اَلنَّحْرِ] مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ** واتە: ( پێغەمبەری خوا – صلى الله علیه وسلم – نەهی لە ڕۆژووی دوو ڕۆژ كردووە، ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و ڕۆژی جەژنی قوربان).

**وَعَنْ نُبَيْشَةَ اَلْهُذَلِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ ﷺ [ أَيَّامُ اَلتَّشْرِيقِ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ, وَذِكْرٍ لِلَّهِ ﷻ ] رَوَاهُ مُسْلِمٌ** واتە: ( ڕۆژانی جەژن ڕۆژی خواردن و خواردنەوەو زیكری خوای گەورەیە).

### - حوكی نوێژی جەژن

قەولی ئەرجەح لەلای شێخولئیسلام – ابن تیمیة – ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێ – دەربارەی نوێژی جەژن ئەوەیە كە واجبە لەسەر تاكە تاكەی مسوڵمانان، ئەوەش مەزهەبی ئەبو حەنیفە و شافعی و ئیمامی ئەحمەدە، وە ئیمامی شەوكانی و شێخی ئەلبانی بەواجبی

دەزانن. ( زاد المعاد، ٢٤٢/١، مجموعة الفتاوى ١٦١/٢٣، السيل الجرار ٣١٥/١، صلاة العيدين في المصلى للالباني).

## - سوننەتەکانی ڕۆژی جەژن

١. خۆڕازاندنەوە: خۆڕازاندنەوەو لەبەرکردنی جل و بەرگی جوان و پاکوخاوێن لە سوننەتی پێغەمبەرە – صلى الله عليه وسلم-

عەبدوڵای کوڕی عومەر– ڕەزای خوایان لێبێت – لە ڕۆژانی جەژندا باشترین و جوانترین جلوبەرگیان لەبەر دەکرد، ئیبنو قودامەی مەقدسی لە ( المغني:٢٨٨/٢) دا دەفەرموێت: ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خۆازاندنەوە لەلای ئەوان شتێکی باوو بووە لەو کاتانەدا.

٢. خۆشۆردن: ئیستیحبابە خۆشوشتن بۆ ڕۆژی جەژن، ئیبنو عومەر - ڕەزای خوایان لێبێت– لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان خۆی شۆردووە، ڕیوایەت کراوە کە ئیمامی عەلی لەو ڕۆژەدا خۆی شۆردووە.( رواه البيهقي وابن ابي النيا، وصحح اسناده ابن حجر في الفتح ٣٢٠/٢).

٣. چوون بەرەو نوێژگا: ئەو شوێنەی بووە کە لە دەرەوەی شاری و لەو دەشت و دەرە نوێژەکەیان تێدا کردووە.

**عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضى الله عنه قَالَ: [ خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - فِي أَضْحَى أَوْ فِطْرٍ إِلَى الْمُصَلَّى..] متفق عليه**

سوننەتە لە نوێژگا (مصلى) نوێژی جەژنەکان بکرێت، ئەوەش قەولی تێکڕای زانایانە (صلاة العيدين في المصلى هي السنة، الالباني). وە هەندێکیش لە ئەهلی عیلم بە واجبی دەزانن.

بۆ ئەو کەسانەش لاوازن بە هۆی نەخۆشی یاخود پیرو بەککەوتەن دەتوانن لە مزگەوتدا نوێژەکەیان بکەن( المغني ٣٢٠/٢) سوننەتە ئافرەتانیش ئامادە بن بۆ نوێژ لە (مصلى).

**وَعَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ قَالَتْ: [أُمِرْنَا أَنْ نُخْرِجَ اَلْعَوَاتِقَ, وَالْحُيَّضَ فِي الْعِيدَيْنِ; يَشْهَدْنَ الْخَيْرَ وَدَعْوَةَ اَلْمُسْلِمِينَ, وَيَعْتَزِلُ اَلْحُيَّضُ اَلْمُصَلَّى ] أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ**

بەڵام ئافرەتان کە لە حاڵەتی حەیزو بێنوێژی دابن، تخونی ئەو جێگەیە ناکەون و نوێژیش ناکەن، بەڵکو دوور بە دووری ڕادەوەستن و بەشداری خۆشیەکانی جەژن دەبن لەو کاتەدا.

سوننەتیشە بە پێ ڕێکردن بەرەو (مصلى) ئیمامی عەلی ڕەزای خوای لێبێت دەفەرموێت: ( ان من السنة ان تاتي المصلى ماشيا) ( صحيح الترمذي للالباني ١٦٤/١).

٤. تەکبیر لێدان لە ڕۆژانی جەژن

وارید بووە کە پێغەمبەری خوا – صلى الله عليه وسلم- لە ڕۆژی یەکەمی جەژنی ڕەمەزان تەکبیری لێداوە تاوەکو گەیشتۆتە (المصلى) بەردەوام بووە تاوەکو نوێژی جەژنی کردووە، دوای ئەوە چیتر تەکبیری لێ نەداوە( السلسلة الصحيحة ١٧٠).

ئەو فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەرئەوەی جائیزە بە ڕێگاوەو بە دەنگی بەرزەوە تەکبیر لێ بدرێت.

## - چۆنیەتی تەکبیرەی ڕۆژی جەژن

چۆنیەتی تەکبیرەکەشی بەم چەند شێوازە بووە ( الارواء ١٢٥/٣-١٢٦) ( واحكام العيدين للشيخ علي بن حسن).

- الله اكبر الله اكبر لا اله الا الله والله اكبر، الله اكبر ولله الحمد.

- الله اكبر الله اكبر الله اكبر كبيرا.

- الله اكبر الله اكبر لا اله الا الله والله اكبر ولله الحمد، الله اكبر واجل، الله اكبر على ما هدانا.

٥. پێش دەرچوون بەرەو نوێژی جەژن سوننەت وایە چەند دەنکە خورمایەك بخوات، وەك ئەنەس ڕیوایەتی کردووەو دەفەرموێ: **[ كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ ﷺ لَا يَغْدُو يَوْمَ اَلْفِطْرِ حَتَّى يَأْكُلَ تَمَرَاتٍ] أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ**

٦. ڕێ گۆڕین لە چون و هاتنەوە: ئەمەش لە سوننەتەوەیە، ئەو ڕێیەی پێیدا ڕۆیشتووە لە هاتنەوەیدا بیگۆڕێت و بە ڕێگایەکی تردا بێتەوە.

**وَعَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ:[ كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ ﷺ إِذَا كَانَ يَوْمُ اَلْعِيدِ خَالَفَ اَلطَّرِيقَ] أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ رواه البخاري ٩٨٦.**

٧. هیچ نوێژێك لە پێش یاخود لە دوای نوێژی جەژنەوە نەکات، **عَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ: [ أَنَّ اَلنَّبِيَّ ﷺ صَلَّى يَوْمَ اَلْعِيدِ رَكْعَتَيْنِ, لَمْ يُصَلِّ قَبْلَهَا وَلَا بَعْدَهَا] أَخْرَجَهُ اَلسَّبْعَةُ**

## - کاتی نوێژی جەژن

جمهوری زانایان دەفەرموون: کاتەکەی دەکەوێتە ئەو وەختەوە کە ڕۆژ بە ئەندازەی ڕمێك بەرزبوبێتەوە.

## - نوێژی جەژن بەبێ بانگ و قامەت

لە ئیبنو عەبباس و جابرەوە ڕەزای خوایان لێبێت دەفەرموون: بانگ نەدەدرا بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان و، قامەتیش دانەدەبەسترا، وە نەووتراوە (الصلاة جامعة) وەك ئەوەی ئەمڕۆ باوە، بەڵکو سوننەت وایە هیچ نەوترێت و ئیمام دایبەستێتە نوێژ کردن.

**وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: [ أَنَّ اَلنَّبِيَّ ﷺ صَلَّى اَلْعِيدَ بِلَا أَذَانٍ, وَلَا إِقَامَةٍ]  أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ**

## - چۆنیەتی نوێژی جەژن

تەواوی نوێژەکە تەنها دوو ڕکاتە وەك لە فەرمودەکەی ئیبنو عومەردا هاتووە - ڕەزای خوای گەورەیان لێبێت: **[ صلاة السفر رکعتان، وصلاة الاضحى رکعتان، وصلاة الفطر رکعتان تمام غير قصر، على لسان محمد – صلى الله عليه وسلم -]**

دوو ڕکاتەکەش بەم شێوەیە دەبێ:-

- لە ڕکاتی یەکەم تەکبیرەی ئیحرام دادەبەستێ و دواتر حەوت تەکبیران لێدەدات.

- سوڕەتی فاتیحە و دوای ئەویش سوڕەتێکی تر دەخوێنێت، وەك هەر نوێژێکی ئاسایی، وە ڕکوع و سوژدە دەبات و هەڵدەستێتەوە بۆ ڕکاتی دووەم.

- بەهەمان شێوە بۆ ڕکاتی دووەم هەڵدەستێتەوە، بەڵام ئەم جارەیان لە جیاتی حەوت تەکبیرە تەنها پێنج تەکبیران لێدەدات و، ئینجا دەچێتە ڕکوع و سوژدەو دواتریش جەلسەی تەشەهەود دەخوێنێ و ئینجا سەلام دەداتەوە.

**وَعَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ قَالَ: قَالَ نَبِيُّ اَللَّهِ ﷺ [ اَلتَّكْبِيرُ فِي اَلْفِطْرِ سَبْعٌ فِي اَلْأُولَى وَخَمْسٌ فِي اَلْآخِرَةِ, وَالْقِرَاءَةُ بَعْدَهُمَا كِلْتَيْهِمَا ]  أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ**

سوننەتە دوای سوڕەتی فاتیحە سوڕەتەکانی **{ اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ }** و **{ ق }** بخوێنێت (اخرجه مسلم) ئیبنولقەییم - ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێت- دەفەرموێت: لەوانەیە سوڕەتی **{ سبِّح اسمَ رَبِّك الأَعْلى }** و **{ هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ }** ی خوێندبێت ( اخرجه مسلم).

هەرکەسیش فریای نوێژ نەکەوت دەتوانێ لە (المصلى) یاخود لە ماڵەوە نوێژەکەی بکات (ئەوەش ڕای ئیمامی مالیکە کە لە الموطا باسی کردووە، ئیمامی بوخاریش لەژێر بابێکی تایبەت بە ناوی - باب اذا فاته العيد يصلي ركعتين- بەهەمان شێوە باسی کردووە، -عطاء- یش وا دەفەرموێ و، ئەوەش مەزهەبی ئیمامی شافعییە).

## - وتاری جەژن

سوننەتە وتارەکە بکەوێتە دوای نوێژی جەژنەوە، ئیبنو عەبباس – ڕەزای خوایان لێبێت – دەفەرموێت: نوێژی جەژنم کردووە لەگەڵ پێغەمبەری خوا – صلى الله عليه وسلم – هەروەها لەگەڵ ئەبوبەکر و ئیمامی عومەر و ئیمامی عوسمان ڕەزای خوایان لێبێت، هەموویان وتاری جەژنیان دەخستە دوای نوێژەوە.

**وَعَنِ ابْنِ عُمَرَ: { كَانَ اَلنَّبِيُّ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ, وَعُمَرُ: يُصَلُّونَ الْعِيدَيْنِ قَبْلَ اَلْخُطْبَةِ }  مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ**

ئیبنولقەییم ڕەزای خوای لێبێت لە (زاد المعاد ٤٨٨/١) دا دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا – صلى الله عليه وسلم- ڕوخسەتی داوە بەو کەسەی کە نوێژەکەی کردووە، بمێنێتەوە بۆ گوێ گرتن لە وتاری جەژن یا بڕوات. (صحيح ابي داوود للالباني ١٠٤٨).

## - چۆنیەتی جەژنە پیرۆزە

سوننەتە بوترێت **[ تَقَبَّلَ اللَّهُ مِنَّا وَمِنْك ] (صحيح ابي داوود للالباني ژمارە ٩٤٨).**

شێخولئیسلام لەسەر هەمان بۆچوونە کە دەبێ بەم شێوەیە پیرۆزبایی بکرێت، بەڵام وتنی وشەی (كل عام وانتم بخير) لە نەصرانییەکانەوە وەرگیراوەو مسوڵمان دەبێ خۆی بەدوور بگرێ لەو جۆرە پیرۆزبایی کردنە.

# تەوەرەباسی هەشتەم: شەشەڵان

## - گەورەیی شەشەڵان

**وَعَنْ أَبِي أَيُّوبَ اَلْأَنْصَارِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ ﷺ قَالَ: [ مَنْ صَامَ رَمَضَانَ, ثُمَّ أَتْبَعَهُ سِتًّا مِنْ شَوَّالٍ كَانَ كَصِيَامِ اَلدَّهْرِ ]  رَوَاهُ مُسْلِمٌ**

واتە: ( ئەوەی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێ، دواتر شەش ڕۆژ لە شەووال بەڕۆژوو بێت، وەك ئەوە وایە ساڵەکە بەڕۆژوو بوبێت).

ڕۆژی یەکەمی جەژنی لێدەرچێ، ئەگەر نا دەتوانێ لە ڕۆژانی تردا شەشەڵانەکەی بگرێ، فەرق ناکات هەمووی بەسەر یەکەوە یا بە پچڕ پچڕی بگرێ، گرنگ ئەوەیە ڕۆژووەکانی لە مانگی شەووالدا بێت.

## تەوەرەباسی نۆیەم: ڕەمەزان لە مێژووی ئیسلامیدا

مێژووی ئیسلامی لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا زۆر ڕووداوی دڵخۆشکەرو لە هەمان کاتدا ڕووداوی دڵتەزێنیشی تێدایە، لێرەدا هەندێکیان لێ باس دەکەین:-

- لە ساڵی دووەمی هیجری ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان فەرزکرا.

- لە یەکەم ڕۆژی ڕەمەزانی ساڵی بیستی هیجری و لەسەردەمی خەلافەتی عومەری کوڕی خەتتاب فەتحی مصر لەلایەن عەمرو بنو عاصەوە کرا – ڕەزای خوای گەورەیان لێبێت-

- لە ڕۆژی دووەمی ڕەمەزانی ساڵی هەشتا و دووی هیجری لەشکری مسوڵمان توانیان بگەنە مەغریبی ناوەڕاست و فەتحی بکەن، وە لەژێر دەستی ڕۆمەکانی دەربێنن.

- لە ڕۆژی سێیەمی ڕەمەزانی ساڵی سی و حەوتی هیجری، جەلسەی تەحکیمی نێوان علي و معاويه - ڕەزای خوای گەورەیان لێبێت- بەسترا، ئەمەش دوای ڕوداوەکەی جەمەل بوو لە ساڵی سی و شەشی کۆچی، ئەوکاتەش هاوکات بوو لەگەڵ سەرهەڵدانی خەواریجەکان.

- لە ڕۆژی چوارەمی ڕەمەزانی ٩٢٧ ی هیجری سوڵتانی عوسمانی توانی فەتحی شاری بلغراد بکات.

- لە ڕۆژی پێنجی ڕەمەزانی ساڵی ٦٦٦ هیجری، لەشکری مسوڵمانان بە قیادەی بیبەرس توانیان شاری (انطاكية) لەژێر دەستی خاچپەرستان دەربێنن، دوای ئەوەی بۆ ماوەی ١٧٠ ساڵ داگیریان کردبوو.

- ڕووداوی غەزوەی تەبوك لە ڕۆژی هەشتی ڕەمەزانی ساڵی نۆی هیجریدا بوو.

- لە ڕۆژی نۆیەمی ڕەمەزانی ساڵی ٩٣ ی هیجری قائیدی بە ناوبانگی ئیسلام موسى بن نصير توانی حەملەی غەزوی ئەندەلوس درێژە پێ بدات و فەتحی ئیشبیلییە و طليطلە بکات.

- لە ڕۆژی یازدەی ڕەمەزانی ساڵی ٩٥ ی هیجری سەعیدی کوڕی زوبەیر بە دەستی حەجاج دەکوژرێت.

- له ڕۆژی یازدەی ڕەمەزانی ساڵی ٩٨٦ ی هیجری عوسمانییەکان توانیان له جەنگی "شماهي" سەرکەون بەسەر صەفەوییەکان له ناوچەی قەوقاز و نزیکەی ١٥ هەزاریان لێ بکوشتن.

- له یازدەی ڕەمەزانی ساڵی ١٢٩ ی هیجری دەعوه و بانگەوازی عەبباسییەکان له خوڕاسان لەسەر دەستی ابي مسلم الخراساني سەری هەڵدا.

- له دوازدەی ڕەمەزانی ساڵی ٥٩٧ ی هیجری ئیمامی بەرزی ئیسلام " ابو الفرج بن الجوزي" زانایەکی بەڕێزی ئەهلی عێراق و فەرموودەناس و شارەزایەکی فیقهو زمان و تەفسیر بووه.

- له پازدەی ڕەمەزانی ساڵی ١٢٢٤ی هیجری له جەنگی "تاتاریجه" دەوڵەتی عوسمانی توانی بەسەر جەیشی ڕوسی سەرکەوێ و نزیکەی ١٠ هەزار سەربازیان لێ بکوژن.

- له حەڤدەی ڕەمەزانی ساڵی ٢ ی هیجری غەزوەی بەدری گەوره ڕویدا که پێغەمبەر نازدارمان- صلى الله عليه وسلم – بۆخۆی تێیدا بەشدار بوو، یەکەمین ڕووبەڕووبونەوەی سەربازی و سەرکەتنی مسوڵمانان بوو بەسەر موشریکەکانی قوڕەیشدا، ئەم غەزوەیە له قورئانی پیرۆزدا بە " يوم الفرقان " ناوبراوه، ژمارەی مسوڵمان ٣١٣ کەس و موشریکەکانیش هەزار کەس بوون، ١٤ له مسوڵمانان شەهید بوون و له کافرانیش ٧٠ کوژراو ٧٠ به دیلی کەوتنه بەردەستی مسوڵمانان.

- له حەڤدەی ڕەمەزان، وتراویشه له یازدەی ڕەمەزانی ساڵی ٩٥ ی هیجری حەججاجی کوڕی یوسفی سەقەفی له تەمەنی ٥٤ ساڵی له عێراق وەفاتی کرد.

- له بیستی ڕەمەزانی ساڵی ٥١ ی هیجری مزگەوتی بەناوبانگی قەیرەوان که دەکەوێته وڵاتی تونسەوه لەسەر دەستی عوقبەی کوڕی نافع - ڕەزای خوای گەورەی لێبێت بینا کراوه.

- له بیست و یەکی ڕەمەزانی ساڵی ٨ ی هیجری فەتحی مەککه کرا، ئەو ساڵە ناونرا "عام الفتح " که خەڵکی دوای ئەوه کۆمەڵ کۆمەڵ و دەسته دەسته دەهاتنه ناو ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوه، لەناو ئەوانیشدا مسوڵمان بوونی ابي سفيان - ڕەزای خوای لێبێت.

- له ڕۆژی هەینی و له ٢٥ ی ڕەمەزانی ساڵی ٦٥٨ ی هیجری مسوڵمانان به سەرکردایەتی سيف الدين قطز توانیان له مەعرەکەی " عين جالوت" بۆ یەکەمین جار بەسەر جەیشەکەی هۆلاکۆ " تەتار" دا سەرکەون.

- هاوەڵی بەڕێز عمرو بن العاص - ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت- لە سی ڕەمەزانی ساڵی ٤٣ ی هیجری لە تەمەنی سەد ساڵیدا وەفاتی کرد.

- لە سی ڕەمەزانی ساڵی ٢٥٦ ی هیجری خاوەنی صەحیحی بوخاری، کە ناسراوە بە ئیمامی بوخاری وەفاتی کرد، کە بێگومان صەحیحی بوخاری کۆکراوەی فەرمودەکانی پێغەمبەرە – صلی الله علیه وسلم- بە سەحیحترین کتێب دادەنرێت دوای قورئانی پیرۆز. هەروەها نوسەری هەریەك لە "التاريخ الكبير" و"الأدب المفرد" ە ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێت.

## گرنگترین سەرچاوەکان


١. القرآن الكريم

٢. صحيح البخاري

٣. صحيح مسلم

٤. رياض الصالحين

٥. بلوغ المرام (كتاب الصيام)

٦. قيام رمضان (فضله وكيفيتة ادائه..) للشيخ العلامة محمد ناصرالدين الالباني- رحمه الله

٧. احكام زكاة الفطر والعيد، للشيخ محمد العبيدلي.

٨. صيام رمضان ، أحكام ومسائل، أبو طارق، إحسان بن محمد بن عايش العتيبي